بەشێک لە پەیامەکانی نوور



# بەڵگەی درەخشان





بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

**ئەم پەیامە:**

* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی تورکی دایناوە.
* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.
* (**فاورووق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) لەگەڵ دەقی عەرەبییەکەدا بەرامبەری کردووە.
* چاپی یەکەم: سلێمانی ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز.
* (**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**) نەخشەی بەرگی کێشاوە و بڵاوی دەکاتەوە.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٦٤)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# بەڵگەی درەخشان

بۆ بابەتەكانی ئیمان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

كردوویە بە كوردی

# تیشکی پازدەهەم

## بەڵگەی درەخشان

(لە دوو مەقام پێکهاتووە)

ئەم وانەیە لە ڕواڵەتدا بە پەیامێکی بچووك دەردەکەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا پەیامێکی بەهێز و فراوانە و، میوە و بەروبوومێکی ئیمانی و قورئانی و بەهەشتییە کە ژیانی بیرکردنەوەم و یەکگرتنی "علم الیقین" و "عین الیقین" لە ژیانی مەعنەوی و تەحقیقیی نووردا بەرهەمیان هێناوە.

سەعیدی نوورسی

# مەقامی یەکەم

## (سێ بەشە)

### بەشی یەکەم

### لەو دەرسەی کە لە سێهەم قوتابخانەی یووسفیدا وترایەوە و، پوختەی کورتەی مەکتووبی بیستەم

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

وَبِهِ نَسْتَعِينُ

ئەو کەسەی کە سی و پێنج ساڵی تەمەنی بە گۆشەگیری و دووری لە خەڵکی بەسەربردووە و.. ماڵئاوایی لە دنیا کردووە و لە بیری چووەتەوە، بە تایبەت لە شەوگارەکاندا.. ئەو کەسەی کە تەنانەت لە خەڵکیش بێزار بووە، لەبەر ئەو چاودێرییە پڕ لە ڕق و قینەی کە بیست و سێ ساڵی ڕەبەق پێوەی گیرۆدە کرا، بە ڕادەیەك کە دڵگرانە بەوەی یەك سەعاتی تەمەنیشی لەگەڵ یەك کەس و لە یەك شوێندا بەسەر بەرێت، جگە لەوەی کە ئارەزوومەندی پەیامەکانی نوورە و یارمەتیی دەدات..

ئەم کەسە لاواز و دەستەوسانەیان بە زۆرەملێ گواستەوە بۆ زینـدانی ژمـارە پێنج کە تابلێی پڕ حەشامات و جەنجاڵە و، نەشیاندەهێشـت برایـانم سـەردانم بکەن، بە بیـانووی ئەوەی کە دەعـوایەکم پێشـکەشی دادگـای تەمییـز کـردووە لەبارەی ئەوەی کە یازدە مانگە لە زیندانی تاکەکەسیدا دانراوم!

لەو کـاتەدا کە دڵتەنـگ و نـیگەرانی ئەوە بـووم نەتـوانم لەم قەرەبـاڵغییە چڕوپڕەدا بژیم، کتـوپڕ کەش و هەوا - وەك نیشـانەیەك لەسـەر غەزەبی خـوای گەورە - لەڕادەبەدەر گـۆڕا و سـارد بـوو، بە ئەنـدازەیەك کە دڵنیـام گەر لە شوێنەکەی پێشوومدا بوومایە نەمدەتوانی بەرگەی ئەو سەرمایە بگـرم. ئیـتر ئەو ناخۆشی و تەنگانەیەم لێ بوو بە خۆشی و، ئەو سەختییەش سـەبارەت بە مـن بوو بە میهرەبانییەکی خوای گەورە. یەکسەر ئەوەم بە دڵدا هات کە:

هەرچەند قوتابیانی نوور لە بریی تۆ ئەرکی سەرشـانیان جێبەجـێ دەکەن و لە هەموو هۆڵەکانی بەندیخانەدا بە چوست و چالاکی و لێبڕانەوە ڕاسـتییەکانی پەیامەکانی نوور ڕادەگەیەنن، کەچی ئەم ژووری ژمارە پێنجە، کە وەك شـوێنی گۆشەگیریی زاهیـدەکان وایە، هەمیشـە نـوێ دەبێـتەوە و ئـاڵوگۆڕی بەسـەردا دێت، کەواتە لە هەموو ژوورەکانی تر پێویستیی زیاتری بە وانەکانی نوور هەیە.

هەروەها بێ گومان لاوان و پیـرانیش گەلـێ پێویسـتیان بە چەنـد وانەیەکی دڵنیاییبەخش و دامەزراو هەیە لە بارەی چەسپاندنی "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورەوە، چونکە لە ڕۆژنامەکانـدا هێرشـە ئیلحـادییە ترسـناکەکانی ڕووس بـۆ سەر ئیمان و ئینکاریکردنی بەدیهێنەری مەزن، دەخوێننەوە.

ئەمە بوو کە لە دەمی خوێندنی زیکرەکـانی دوای نـوێژ بە دڵمـدا هـات و، منیش لە لایەنی خۆمەوە ئەو تەهلیلەیەم خوێنـد کە هەر لە مێـژە دوای نـوێژی بەیانیان دە جار دەیخوێنم و بریتییە لە:

(لا إلهَ إلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيْتُ وَهُوَ حَيٌّ لا يَمُوْتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ وَإلَيهِ الْمَصِيْرُ)[١].

ئەم تەهلیلە گەورە و تەوحیدە مەزنەی کە بەپێی ڕیوایەتێك ئیسمی ئەعزەمی لەخۆ گرتووە، مەکتووبی مەزنی بیستەم بە درێژی و لە یازدە وشەیدا و، لە ناوەندی یازدە بەڵگەی پێویستیی "بوون" و "یەکتایی" پەروەردگارێتیدا و، بە وێنەی خۆری درەخشان ڕوونی کردووەتەوە و، یازدە مزگێنی و مژدەی دڵخۆشکەریشی لەسەر هێناوەتەوە.

بەڵێ، هاودەم لەگەڵ بیرکردنەوەم لە پوختەیەکی کورتی مەکتووبی بیستەمدا، زۆر بە قووڵی و تێڕامانەوە ئەم ڕستە خاوێن و پیرۆزەم دووپات دەکردەوە. کتوپڕ ئەوەم بە گوێی دڵدا درا کە: ئەم پوختەیە وەك دەرسێك بە زانای بەڕێز "نادر" و ئەو لاوانە بڵێرەوە کە لێرەدا ماونەتەوە.

منیش لە لایەنی خۆمەوە وتم: "بسم الله" و، دەستم بە وتنەوەی ئەم وانەیە کرد:

ئەم گوفتارە تەوحیدییە، یازدە مژدە و یازدە بەڵگەی ئیمانیی تێدایە. وا زۆر بە کورتی تەنها ئاماژە بۆ بەڵگەکان دەکەم و، درێژەپێدانی ئەم بەڵگانە و مزگێنییەکانیشیان بە مەکتووبی بیستەم و بەشەکانی پەیامەکانی نوور دەسپێرم.

---

(١) كان ﷺ يقول في دُبر كل صلاة مكتوبة (حين يسلم): لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد (يحيي ويميت، وهو حي لا يموت بيده الخير وهو على كل شيءٍ قدير). "ثلاث مرات". اللهم لا مانع لما اعطيت ولا معطي لما منعت ولا ينفع ذا الجدّ منك الجدّ. صحيح. الأحاديث التي هي خارج الأقواس موجودة في البخاري ومسلم. والزيادة الأولى المحصورة بين القوسين لأحمد وأبي داود، والثانية للطبراني والثالثة للنسائي وأبي خزيمة. أقول: وهذا الحديث الذي أورده الأستاذ النورسي من العجائب، إذ عندما تتبعت أحاديث الورد في الصباح والمساء وبعد الصلاة وجدتها تختلف بالسياق. وجمع الزيادات بهذه الطريقة صعبة للغاية تحتاج إلى مصادر واسعة وطول باع في الحديث، فياترى ما تفسير إيراد الأستاذ لهذا النص وبتلك الزيادات دونما رجوع أو توفر مصادر كالتي يمتلكها المحدّثون.. إن التفسير الوحيد هو: إكرام إلهي. (فلاح)

کـاتێ کە ئەم دەرسـەم نـووسی پـێم بـاش بـوو ئەو وتە و سـەرنجانەشی تێهەڵکێش بکەم کە لە دەمی وتنەوەیدا بۆ بەندکراوانم باس نەکردبوون.

جا یازدە وشەکانی ئەو گوفتارە تەوحیدییە بریتین لەمانەی خوارەوە:

❐ **وشەی یەکەم: "لا إلـهَ إلّا اللّٰهُ".**

بەڵگەی ئیمانیی ئەم وشەیە بریتییە لە پەیـامی "الآیـة الکـبری" (بینینەکـانی گەشتیارێك) کە پەیامێکی دەراسا و بێوێنەیە. چونکە ئەم پەیـامە بـوو بە هـۆی تەبرییەبوونی قوتابیانی نوور و، سەرکەوتنیان لە دادگا و بەندیخانەی دەنیزلی و دادگای ئەنقەرەدا و، بڵاوبوونەوەی نهێنییـان بە شـێوەیەکی کـاریگەر. هەروەك چاپکردنیشی بە نهێنی بوو بەهۆی بەندکردنی قوتابیانی ئەو پەیامە بۆ ماوەی نـۆ مانگ.

بەڵـێ، تیشـکی "الآیـة الکـبری" سی و سـێ کـۆدەنگیی گەورە و بەڵـگەی گشتی و هەمەکیـی لە سەرتاسـەری گەردوونـدا دەرخسـت و، هـاودەم لەگەڵ هەموو یەکێکی ئەو بەڵگە گشتییانەشدا ئاماژەی بۆ چەندین بەڵگەی بێسنووری ئەوتـۆ کـردووە کە بە جـۆرێکی درەخشـانی وەك ڕۆژی ڕوونـاك "بـوون" و "یەکتایی"ی خواوەندی "واجب الوجود" دەچەسپێنن..

ئەو پەیامە لە پێشەکیدا زمانی ئاسمانەکان بە "وشـە"ی ئەسـتێرەکان دەخـاتە قسە و، پاشـان زەویـش بە "ڕسـتە"ی ڕووەك و زینـدەوەران دەخـاتە گـۆ و، تـا دەگاتە ئەوەی کە سەرانسەری گەردوون بە وشەکانی چەنـدین حەقـیقەتی وەك "حدوث" و "ئیمکان" و "ئاڵو گۆڕ" دەخاتە قسە و گوفتار.

دەبا ئەو کەسانەی کە بە دوای ئیمانێکی دامەزراوی توندوتۆڵ و شمشـێری تیژدا دەگەڕێن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی فەوزای ئیلحـاد و بێبـاوەڕی، سـەردانی پەیامی "الآیة الکبری" بکەن و بیخوێننەوە.

**❐ وشەی دووهەم: "وَحْدَهُ".**

بەم جۆرەی خوارەوە پوختە ئاماژەیەك بۆ ئەو بەڵگەیە دەکەین کە لەم وشەیەدا هەیە:

هەموو شوێن و لایەن و ڕوویەکی ئەم گەردوونە "یەکبوون"ێکی ڕوونی پێوە دەبینرێت.

بۆ نموونە: سەرانسەری گەردوون وەك شارێکی ئاوەدان و کۆشکێکی بەرین و کتێبێکی ڕەوانی بەرجەستە وایە، بە ڕادەیەك کە هەموو ئایەتێکی، بەڵکو هەموو پیتێکی، تەنانەت هەموو نوختەیەکیشی لە حوکمی موعجیزە و قورئانێکی بەرجەستەدایە.

بەڵێ، هەروەك ئەم دیاردەیە "یەکبوون"ێکی ڕوون و ئاشکرا لە گەردووندا پیشان دەدات، بە هەمان جۆر دەبینین کە:

گڵۆپی ئەو کۆشکە یەك گڵۆپە و.. چراکەشی کە وەخت و کاتەکانی بۆ دیاری دەکات، یەکێکە و.. کوڵێنەری گرداری خواردەمەنییەکانی یەکێکە و.. ئاودێریشی یەکێکە و.. بەم جۆرە: یەکێکە.. یەکێکە.. یەکێکە.. تا دەگاتە هەزار و یەك "یەکێکە" و "یەکبوون".

جا گەردوون بە دەرخستنی ئەم یەکبوونەی هەموو شتێك، دەیچەسپێنێت کە خاوەن و نووسەر و دانەری ئەو کۆشك و شار و کتێبەی کە خۆی لە خۆیدا قورئانێکی گەورەی بەرجەستەیە، خاوەنی "بوون"ە و "تاك و تەنیا"یە.

**❐ وشەی سێهەم: "لا شَريكَ لَهُ".**

ئاماژەی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشەیەدا هەیە، بریتییە لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿**قُلْ لَوْ كانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إذاً لابْتَغَوْا إلى ذِي الْعَرْشِ سَبيلاً**﴾(الإسراء:٤٢) کە سەرچاوە و بناغە و مامۆستای تیشکی "الآية الكبرى"یە.

بەڵێ، ئەگەر چەند خوایەکی تری لەگەڵدا ببوایە و دەستیان لە بەدیهێنان و کاروباری پەروەردگارێتیدا هەبوایە، ئەوا ڕێسای سەرانسەری گەردوون تێکدەچوو..

بەڵام خۆ هەموو شتێکی ئەم گەردوونە، هەر لە باڵی مێش و بیلبیلەی چاوی و خانە بچووکەکانی جەستەیەوە هەتا دەگاتە فڕۆکەکانی ئاسمان، کە بریتین لە باڵندە لەژمارەبەدەرەکان و، لەوانیشەوە تا دەگاتە کۆمەڵەی خۆر، هەروەها لە هەموو شتێکی بوونەوەردا چ جوزئی بێت و چ کوللی، گەورە بێت یان بچووك، وردترین و کاملترین ڕێسا و ڕێکوپێکی بە چاو دەبینرێت. کە ئەمەش بە ڕادەیەکی ئەوتۆ ئەم ڕێسا هەرە کامڵ و تەواوە دەچەسپێنێت کە هیچ گومانێك لە مەحاڵیی شیرك و هاوبەشایەتیدا ناهێڵێتەوە و، دەریدەخات کە ئەو شیرکە هەر وجوودی نییە و، بە جۆرێکی ڕوونیش "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی "واجب الوجود" دەچەسپێنێت.

❏ **وشەی چوارەم: "لَهُ الْمُلْكُ".**

ئاماژەی یەکجار کورت بۆ ئەو بەڵگە دوور و درێژەی کە لەم وشەیەدا هەیە، بریتییە لەمەی خوارەوە:

ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین کە لە پشت پەردەی غەیبەوە کەسێکی خاوەن توانستی ڕەها و زانستی بێسنوور هەیە کە کاروبارەکان بەڕێوەدەبات و دەستکارییان دەکات. چونکە ڕووی فراوانی زەویی کردووە بە کێڵگەیەکی تابلێی بەرین و لە هەموو بەهارێکدا زیاد لە تۆوی سەد هەزار جۆر "ڕووەك"ی پێکەوە و بە تێکەڵی بەسەردا بڵاو دەکاتەوە و، پاشان بەرهەم و داهاتەکانیان بە جیاجیا و بێ تێکەڵی و لێ تێکچوون و هاودەم لەگەڵ ڕێکوپێکییەکی کامڵدا دەچنێتەوە و، بە دەستی میهرەبانی و داناییش ڕۆزیی شایستە و دیاریکراوی دووسەد هەزار جۆری زیندەوەران و، بەپێی پێداویستییان، بەسەریاندا دابەش دەکات..

بەم جۆرە، خوای گەورەی بەخشندەی دەوڵەمەند، بە ئەندازەی فراوانیی موڵکە گەورە و بەرینەکەی خۆی، بە تایبەت لە کێڵگەی زەویدا، کاروبارەکان بەڕێ دەکات.

جا ئەو کەسەی باوەڕ بەم پادشا میهرەبان و خواوەندە پەروەردگارە ناهێنێت کە ئاوا بە ڕێکوپێکی کارەکان بەڕێ دەکات، ناچارە بە وێنەی سۆفستائییە گەوج و نەفامەکان ئینکاریی ئەم گۆی زەوییە و داهاتەکانی بکات!

❐ **وشەی پێنجەم: "وَلَـهُ الْحَمْدُ".**

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگە یەکجار فراوانەی کە لەم وشەیەدا هەیە، بریتییە لەمەی خوارەوە:

ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین و بە ژیریشمان تا ڕادەی بەڵگەنەویستی پەی بەوە دەبەین کە:

ڕۆزیدەرێکی میهرەبان و چاکەکارێکی بەخشندە کاروباری شاری گەردوون بەڕێوەدەبات و، سەرپەرشتیی ئیشوکاری گەرەکی زەوی دەکات و، سەرپەرشتی و کاری پەروەردەکردنی سەربازگەی مرۆڤ و زیندەوەرانی لەئەستۆ گرتووە. بە ڕادەیەك کە گۆی زەویی وەك کەشتیی بازرگانی و شەمەندەفەر لێ کردووە بۆ هێنانی ڕۆزیی ئەوان، تاکو لە بەرامبەر بەخشینی نیعمەتە لەژمارە بەدەرەکانیەوە بۆ سوپاس و شوکرانەبژێری هانیان بدات و، وەرزی بەهاری ڕووی زەویشی وەك عەرەبانەیەکی پڕ لە سەد و یەك هەزار جۆری خواردەمەنی لێ کردووە و مەمك و گوانەکانیشی - کە وەك قوتووی شیر وان - لە شیر پڕ کردووە بۆ فریاگوزاریی ئەو موحتاجانەی کە لە کۆتایی زستاندا ئازووقەیان لێ بڕا.

جا هەر کەسێك خاوەنی هێندەی گەردیلەیەك ژیری بێت، بێ هیچ گومانێك باوەڕ دەهێنێت بەوەی کە ئەم کارە هی ڕۆزیدەرێکی میهرەبانە. دەنا ئەو کەسەی کە باوەڕ بەمە ناهێنێت و بە تەواوی لە ڕێ دەترازێت، ناچار

دەبێت کە ئینکاریی هەموو نیعمەتە هۆنراوە و ڕۆزییە دەستنیشان کراوەکان بکات کە مایەی ورووژاندنی شوکر و سوپاسن. دیارە کەسی وەهایش جگە لە ئاژەڵێکی گەوجی زیانبەخش هیچی تر نییە!

❑ **وشەی شەشەم: "يُحْيِي".**

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشەیەدا هەیە، ئەوەیە کە بە چەندین بەڵگەی بەهێز لە وتەی دەهەم و چەند بەشێکی پەیامەکانی نووردا چەسپاوە و، بریتییە لەوەی کە:

هەموو بەهارێك لەسەر ڕووی زەویدا سوپایەکی گەورەی خوایی زیندوو دەکرێتەوە، کە لە سێسەد هەزار جۆری زیندەوەران و دانە دانەی بێسنوور و لە چەند شکڵ و شێوەیەکی جۆراوجۆردا پێکهاتوون. دەبینی ژیان بە هەموویان دەبەخشرێت و بە ڕێکوپێکییەکی تەواوەتیش سەرجەم پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دابین دەکرێت، کە ئەمەش سەد هەزار نموونە و نیشانەی حەشری مەزنمان بۆ دەردەخات.

جا ئەو کەسەی کە هەموو ئەو بەدیهاتووە جۆراوجۆرە بێسنوورانە بێ هیچ هەڵە و ناتەواوی و سەر لێ تێکچوونێك زیندوو دەکاتەوە، لە کاتێکدا کە ئەو بەدیهاتووانە لەناو خۆیاندا ئاوێتە و تێکەڵی یەکترین..

هەروەها ئەو کەسەی کە سەرباری تێکەڵبوونی ئەم بەدیهاتووانە لەگەڵ یەکتردا، بێ لەیادچوونی هیچ کامیان، لێکیان جیا دەکاتەوە و، بە کەماڵی ڕێسا و تەرازووکاری ژیانیان پێدەبەخشێت و، لە نوتفەکانی خۆیان - کە چەند دڵۆپە ئاوێکی لەیەکچوون - و، لە ناوکە هاوچەشنەکانیاندا و لەو ناوکۆلە بچووکانەش کە زۆر بە کەمی لە یەك جیا دەکرێنەوە و، لە گەرای مێرووەکان کە وەکو هی یەکتر وان و، لە نوتفە و گەرای باڵندەکانیش کە هەر خودی یەکترین، یان جیاوازییەکی یەکجار کەمیان لە نێواندایە. هەموو ئەوانە زیندوو دەکاتەوە و ژیانیان پێدەبەخشێت..

ئەو کەسەی کە ئەو سەدان هەزار زیندەوەر و گیانـدارانە زینـدوو دەکـاتەوە کە چـەندین دانە دانەی لەژمـارەبەدەری ئەوتۆیـان لەخـۆ گرتـووە شـێوە و سنعەت و گوزەرانیان لە یەکتر جیایە و، ژیانیان بەبەردا دەکاتەوە و، سەد هەزار کتێبی جیا جیا و لە یەك جیاواز پـێکەوە بە شـێوەیەکی تێهەڵکـێش و بـێ هـیچ نـاتەواوییەك و لەوپەڕی وردەکاریـدا لەسـەر لاپەڕەی زەوی و وەرزی بەهـاردا دەنووسـێت و، بە چـاودێری و بـایەخێکی بێسـنوور و دانسـتێکی نەبـڕاوەش دەستکاریان دەکات و کاروباریان بەڕێوە دەبات..

بەڵـێ، ئەو کەسـەی کە ئەم کـارانە ئەنجـام دەدات، تەنهـا خواوەنـدی بەدیهێنەری زانا و ژیانبەخشی حەیی و قەییوومە.

خۆ هەرکەس باوەڕ بەمە نەکـات، بێگومـان ناچـارە کە ئینکـاریی خـۆی و هەموو ئەو زیندەوەرانە بکات کە بە ڕووی زەویـدا بـڵاو بـوونەتەوە و، بەسـەر تەنـافی زەمـان و لە هەمـوو وەرزە ڕابوردووەکـانی بەهـار و لەسـەر ڕووە زیندووەکانی زەوی و فەزای زیندوودا هەڵواسراون.

دیارە ئەو کەسەش، کە ئەم ئینکـارییە بکـات، گەوجـترین و بەدبەختترینـی زیندەوەرانە!

❑ **وشەی حەوتەم: "وَيُمِيتُ".**

ئامـاژەیەکی لەوپەڕی پوختیـدا بـۆ بەڵگەکـانی ئەم وشـەیە، بـریتییە لەمەی خوارەوە:

بە چاوی خۆمان دەبینین کە:

لە وەرزی پایزدا و بە ناوی "مردن"ەوە، سێسەد هەزار جۆری زینـدەوەران لە کارەکانیـان دەحەوێنرێـنەوە، هەمـوو دانە دانە و جـۆرێکی ئەو زینـدەوەرانەش تۆوەکانیان بە دەستی دانستی پارێزەری شکۆمەند دەسپێررێن. ئەو تـۆوانەی کە بریتین لە چەند قوتوویەکی بچووکی نامەی کردار و پێڕستی ئیشـوکارەکانی ئەو زیندەوەرە و، لیستی ئەرکەکانی ئەستۆی لە بەهاری داهاتوودا و، لە ڕوویەکەوە

وەکـو گیـانی بـاقی و زینـدووی ئەو زینـدەوەرە وان. (وەك تـۆوە یەکجـار بچووکەکـانی هەنجیـر کە هەمـوو یاسـاکانی ژیـانی درەختەکەیـان لە خـۆدا هەڵگرتووە و بە وێنەی گیانێکی باقی و نەفەوتاوی ئەو درەختە وان)..

ئیتر بەدیهێنەری دانا و زیندووی نەمر، بە وێنەی نووسـینی نـاو "حـافیزە"ی مرۆڤ، مێژووی ژیانی ئەو درەختەش - کە دەڵێی کتێبێکی مەزن و گەورەیە - بە قەڵەمی قەدەر لەو تۆوەدا دەنووسـێت. جا هەرکەسـێك بـاوەڕی بەم کردگـارە دانا و زیندووە نەمرە نەبێت، نەك هەر تەنها مرۆڤێکی گەوج و نەفام و ئاژەڵێکی بێ هەست و شعوورە، بەڵکو لە شەیتانیش بەدبەختترە و، ئاگری دۆزەخی پـێ خۆش دەکرێت و، بڕیاری مردنی هەتاهەتایی بۆ دەرکراوە.

بەڵێ، ئەم کارە ناوبراوانەی کە ئامـاژە بـۆ بەڵگەکـانی ئەم وشـانە دەکەن و، چەند کارێکی دانایانە و کوللی و گشـتگیر و لەوپەڕی ئیعجـازدان و، چەنـدین مـوعجیزە و کـاری دەراسـای نەبـڕاوە و بێکۆتاییـان لەخـۆ گرتـووە، هەرگیـز ناگونجێت "کار"ی بێ "بکەر" بن، بەڵکو بۆچوونی وا سەد لە سـەد مەحـاڵ و بەتـاڵە. گێـڕانەوە و نیسـبەتدانیشـیان لە هۆکـارە کەڕ و کـوێر و کـۆڵەوار و بێهەسـت و بێگیان و تـێکەڵ و هەڕەمەکی و نارێکەکـان، هەزار ئەوەنـدەی تـر مەحاڵە و بۆچوونێکی بێ بناغەیە!

خۆ ئەگەر ئەو کارە سەرتاپا حیکمەت و دانستانە بـدرێنە پـاڵ هەرشـتێکی تری جگە لە بکەری دانای خۆیان، ئەوا دەبێ توانست و دانستێکی بێسـنوور و وردەکـارییەکی نـاوازە و گشـتی سـەبارەت بە پێکهـاتنی هەمـوو گژوگیـا و گوڵێکەوە لە هەموو یەکـێکی گەردیلەکـانی گڵـدا ببێـت و.. هەمـوو یەکـێکی گەردیلەکانی هەواش توانای تێگەیشتن و تێگەیاندنی سـەرجەم وشـە و قسـە و گوفتارەکانی هەموو ڕادیۆ و تەلەفـۆن و بێتەلەکـانی تێـدا بێـت. وەك لە بـاسی (سـەرنجێکی یەکتانـاسی لە وشـەی "هـو"دا) بـاس کـراوە، کە لە "ڕابەری لاوان"دایە.

دیارە هیچ شەیتانێك نییە بتوانێت قەناعەت لە هیچ کەسێکدا پەیدا بکات سەبارەت بەم چەمکە سەیر و نامۆیە. کەواتە "کوفر" و "ئینکاری" کە تا ئەم ڕادەیە لە بازنەی ژیری بەدەرن و تابیشڵێی لە حەقیقەتەوە دوورن و لە هەمان کاتیشدا سووکایەتی بە سەرجەمی بوونەوەران دەکەن و دەستدرێژی دەکەنە سەر مافەکانیان، جگە لە سزای دۆزەخ - کە عەینی دادگەرییە - هیچ سزایەکی تر شایستە و پڕ بە پێستیان نییە. کەواتە دەبێ بوترێت: "بژی دۆزەخ بۆ ئەوانە"!

❐ **وشەی هەشتەم: "وَهُوَ حَيٌّ لا يَمُوْتُ".**

ئاماژەیەکی یەکجار کورت و پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشەیەدا هەیە، بریتییە لەمەی خوارەوە:

ئەو وردیلە خۆرانەی کە بە ڕۆژدا بەسەر کەف و بڵقەکانی ڕووی دەریا و ڕووباری لەبەر ڕۆیشتووی بەخوڕ دەردەکەون، هاودەم لەگەڵ نەمانی ئەو کەف و بڵقانەدا وردیلە خۆرەکانیش لە پێشچاودا ون دەبن و کەف و بڵقەکانی دوای ئەوان وەکو پێشینەکانیان وێنەی هەمان وردیلە خۆرەکانی پێشوو دەردەخەنەوە. بەم کارەشیان شایەتی دەدەن و ئاماژە بۆ خۆری ڕووی ئاسمان دەکەن. هەروەك بە وەفات و نەمانیشیان دەبن بە بەڵگە لەسەر بوون و مانەوەی بەردەوامی ئەو خۆرەی ناوجەرگەی ئاسمان.

جا هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، بە هەمان جۆر بوونەوەرانی سەر ڕووی دەریای گەردوونی هەمیشە بگۆڕ و، ناو بۆشاییە بێسنوورە بەردەوام نوێبووەکەی و، کێڵگەی گەردیلەکانی، بەخوڕ و خێرایی دەڕژێنە ناو ڕووباری "زەمان"ەوە کە هەموو ڕووداوەکان و بوونەوەرە فانییەکانی لە باوەشی شەپۆلەکانیدا هەڵگرتووە و، ئنجا ئەم بوونەوەرانە هاودەم لەگەڵ هۆکارە ڕواڵەتییەکانیاندا، دەمرن. ئیتر بەم جۆرە، هەموو ساڵێك و هەموو ڕۆژێك گەردوونێك دەمرێت و یەکێکی تری نوێی دێتەجێ و، بەردەوام چەندین دنیای

گەڕۆك و جیهانی بەخوڕەم لە کـێڵگەی گەردیلەکانـدا و دوای لـێ هەڵگرتنـی داهاتەکانی، دەمرن و هی تازە و نوێ جێیان دەگرنەوە.

جـا هەروەك "نەمـان"ی کەف و بڵـق و وردیـلە خۆرەکـان "مـانەوە" و "بەردەوامی"ی خـۆری ڕووی ئاسـمان دەردەخەن، بە هەمـان جـۆر "مـردن" و "نەمـان"ی ئەو بـوونەوەرە بێسـنوور و داهـاتە زۆرانە و، حەوانـدنەوە و لەکارخسـتنیان هـاودەم لەگەڵ لەکارخسـتنی هۆکـارە ڕواڵەتییەکانیانـدا بە حـەوانەوەیەکی لەوپەڕی ڕێکوپێکیـدا، بەڵگـەیەکی بێگومـانی وەك ڕۆژی ڕووناك و خۆری ئاسمان وایە لەسەر "پێویستیی بوونی" خـۆری هەمیشـەیی و زیندووی نەمر و بەدیهێنەری باقی و فەرمانـدەری خـاوێن و، لەسـەر بـوون و یەکتـاییەکەی، بە هەزار جـار ڕوونـتر لەچـاو ڕوونیـی بـوونی خـودی ئەو بـوونەوەرانە. هەمـوو بوونەوەرێـك لە خۆیـدا و هـاودەم لەگەڵ بـوونەوەرانی تریشدا، شایەتن لەسەر ئەم دەرەنجامە.

بێگومان ئێستا مەودای گەوجی و کەڕوکاسی و تاوانباریی ئەو کەسەتان بۆ دەرکەوت کە ئەم دەنـگە بەرزانە نەبیسـتێت کە سەرانسـەری گەردوونیـان پـڕ کردووە و، ئەم شایەتییە بێگومان و ڕاستانەشی بەرگوێ نەکەوێت!

❑ **وشەی نۆهەم: "بِيَدِهِ الْخَيْرُ".**

ئامـاژەیەکی لەوپەڕی پوختیـدا بـۆ ئەو بەڵـگەیەی کە لەم وشـەیەدا هەیە، بریتییە لەمەی خوارەوە:

ئـێمە بە چـاوی خۆمـان لە هەمـوو بـازنە و جـۆر و ڕەگەز و چینـێکی ئەم گەردوونەدا، تەنانەت لە هەموو تاك و دانە دانە و گشت ئەندامێکیدا، بەڵکـو لە هەمـوو خـانەیەکی جەسـتەی ئەو ئەندامانەشـدا، گەنجیـنە و کۆگـایەکی پاشـەکەوتکردنی ئـازووقە و کـێڵگەیەك دەبینـین کە پێداویسـتییەکانی ژیـان و پاراسـتنی ئەوان لەو کـێڵگە و گەنجینـانەدا ئامـادە دەکرێـت و، لە باشـترین و گونجاوترین کات و بە شێوەیەك کە لە حسـابدا نەبـووە و، لە دەرەوەی توانـا و

ویستی ئەو بەدیهێنراوە و، لە ناوەندی ڕێکوپێکییەکی تەواوەتیدا و، بەپێی تەرازوویەکی ورد و بەوپەڕی دانایی و چاودێری، دەستێکی پەنهان بە دەستی ئەو بوونەوەرە موحتاجانەی دەسپێرێت..

بۆ نموونە "چیاکان" کانزا و دەرمان و پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤ و زیندەوەران لەناو خۆیاندا پاشەکەوت دەکەن و، بە فەرمان و کارسازیی خوای گەورەی تاك و تەنیا ئەم چیایانە بەوپەڕی کەماڵ و ڕێکوپێکی لەو پێداویستییانە پڕ کراون.. هەروەك "زەوی"یش کێڵگە و سەرخەرمان و شوێنی کوڵاندنی ڕۆزیی هەموو زیندەوەرانە، کە بە کەماڵی ڕێکوپێکی و، کێش و سەنگ و، هێز و توانای ڕۆزیبەخشی دانا ئەو ئازووقە و ڕۆزییانەی زیندەوەرانی تێدا ئامادە دەکرێت. تەنانەت هەموو مرۆڤێك و، یەك بە یەکی ئەندامەکانیشی کۆگا و گەنجینەیەکی پاشەکەوتکردنی تێدا دانراوە و.. هەموو خانەکانی جەستەشی کۆگایەکی بچووکی لەگەڵدا گونجاوی بۆ ئازووقە یەدەك و پاشەکەوتکراوەکان تێدایە.

بەم جۆرە، هەموو بوونەوەرێك گەنجینەیەکی تێدا دانراوە. تەنانەت گەنجینەی دواڕۆژیش بریتییە لەم خانەیەی دنیا و، کێڵگە و کۆگای بەهەشتیش جیهانی ئیسلام و جیهانی مرۆڤایەتیی ڕاستەقینەیە کە کردەوەی چاك و جوانی و ڕووناکییەکانی لێوە پەخش دەبنەوە! یەکێك لە گەنجینەکانی دۆزەخیش ئەو ماددە گەنیوە چەپەڵ و دەستە و تاقمە پیس و بۆگەنانەن کە گوژاڵکی شەڕ و کوفر و ناشیرینی بەرهەم دەهێنن، لەو شەڕ و خراپکارییانەی کە بەرهەمی "عەدەم"ن و، جیهانی سەرتاپا خێری "وجوود" پیس و ناشیرین دەکەن. هەروەك گەنجینە و سەرچاوەی گەرمیی ئەستێرەکان بریتییە لە دۆزەخ و، گەنجینە و سەرچاوەی ڕووناکییەکانیشیان بریتییە لە بەهەشت.

بەم جۆرە، وشەی: "**بِيَدِهِ الْخَيْرُ**" لە ڕێی ئاماژەکردنیەوە بۆ ئەم هەموو گەنجینە بێسنوورانە، بەڵگەیەکی یەکجار درەخشان دەردەخات.

بەڵێ، ئەم وشـەیە و، دەسـتەواژەی "بِيَـدِه مَقَالِيْـدُ كُـلِّ شَيْءٍ" دوو بەڵـگەی یەکجار فراوانی "پەروەردگاری" و "یەکتایی" خواوەنـدن و، گەلـێ مـوعجیزە و کاری دەراسای بێسنوور بۆ هەر کەسێك دەردەخەن کە چاوی نابینا نەبووبێت.

فەرموو - بۆ نمـوونە - لە ناوەنـدی ئەو گەنجینـە لەسـنووربەدەرانەدا تەنهـا سەیری ئەمەی خوارەوە بکە:

کارسازی دانا و خاوەنی کلیل و جڵەوی ئەو گەنجینە بچووکـانەی هەریەك لەو ناوك و تۆوانە، کە ئامێری پرۆگرامی چارەنووسی درەخـتە گەورەکە یـاخود گوڵە بۆنخۆشەکەی لەخۆدا هەڵگرتووە، هەروەك بە کلیلی ویست و ئیرادە و بە تەرازووی ڕێسایەکی تەواوەتی، فەرمانی: "بێـدار بەرەوە" دەردەکـات و بەمەش دەرگاوانی "تۆو"ێك بەخەبەر دێنێت، بە هەمـان جـۆر و بە کلـیلی "بـاران"یش گەنجیـنەی گەورە و مەزنی گـۆی زەویـش دەکـاتەوە و، بەم کـارەش دەرگـای هەموو گەنجینە بچووکەکانیش دەخاتە سەرپشت کە بریتین لە وردیلە ناوکەکان کە نوتفەی ڕووەکەکانن و، سەرجەم بنەمای زیندەوەران و، ئەو دڵۆپە ئـاوانەش کە نوتفەی ئەو باڵندە و مێروانەن کە لە هەوا و ئاو پێکدێن..

ئەو کارسازە دانایە، دەرگای هەمـوو ئەم گەنجینـانە پـێکەوە و بە بـێ هـیچ هەڵەیەك و بە ئاراستەکردنی فەرمانی "کردنەوە" و "دەرکەوتن" و، وەرگرتنـی ئەو فەرمانەش لە لایەن ئەوانەوە، دەخـاتە سەرپشـت. هەروەك لە هەمـان کاتـدا بە دەستی دانایی و ویست و میهرەبـانیش هەمـوو گەنجیـنە کـوللی و جـوزئی و ماددی و مەعنەوییەکانی گەردوون و، هەریەکەیـان بە کلـیلی تـایبەتیی خـۆی، دەکاتەوە.

ئەگەر حەز دەکەیت ئەمە بزانیت و ببینیت، ئەوا فەرموو سەیرێکی گەنجینە بچووکەکانت بـکە کە بـریتین لە دڵ و مێشـك و گەدە و جەسـتەت. هەروەهـا سەیری باخچەکەت و وەرزی بەهاریش، کە گوڵی زەویـیە و، سـەیری گـوڵ و بەروبوومەکانیشی بکە. چونکە خـوای گەورە بە دەسـتێکی غەیبـی و بە چەنـد

کلیلێکی جیا جیا و جۆراوجۆری کارگەی "کُنْ فَيَکُـوْن" و بە کەمـاڵی ڕێسـا و تەرازووی میهرەبـانی و دانـایی، ئەو گەنجینـانە دەکـاتەوە و، کـاتی وا هەیە لە کێشی درەمێك وردیلە قوتوو سەد باتمان خواردەمەنی بە کەماڵی ڕێکـوپێکی و تەرازووکاری دەردەهێنێت و میواندارییەکی ڕەنگینی بـۆ زینـدەوەران پـێ سـاز دەکات.

جا ئایا دەگونجێت هێزێکی کتوکوێر و سروشتێکی کەڕولاڵ و ڕێکەوتێکی هەڕەمەکی و چەند هۆکارێکی بێگیانی نەزانی دەستەوسان، لە کارێکدا خۆیـان هــەڵبقورتێنن کە تـا ئەم پـلەیە بە ڕێکـوپێکی و زانـایی و بەسـیرەت ئەنجـام دەدرێت و، لە سنعەتێکی وردی خاوەن دانستی تەواودا کە هەرگیـز ڕێـکەوت تــوخنی ناکەوێــت و، لە هەڵســوکەوتێکی تەرازووکــراوی ئەوتــۆدا کە هــیچ هەڵەیەکی تێــدا نیــیە و، لە پەروەردگــارێتییەکی مەزنی خــاوەن دادگەریــیەکی ئەوتۆدا کە هەرگیز ستەمی تێدا نییە؟!

یان ئایا دەگونجێت کەسـێك کە لە یەك کاتـدا هەمـوو شـتێك نەبینێـت و، نەتوانێت هەموویان پێکەوە و بە یەك جار بەڕێـوە بەرێـت و، ئەتـۆم و ئەسـتێرە گەڕۆکەکان پێکەوە نەخاتە ژێر فەرمانی خۆی.. لەم کـارگێڕی و بەڕێـوەبردن و کارڕاییکردنانەدا خۆی هەڵبقورتێنێت کە هەموو لایەکیان دانست و موعجیزە و میزانە؟

بەم جۆرە دەردەکەوێـت کە هەرکەسـێك بـاوەڕی بەم کارسـازە میهرەبـان و دانـایە نەبێـت، کە ئەم کاروبـارانە ڕایـی دەکـات و جـڵەوی هەمـوو خێـر و کاروبارێکی لە دەسـتدایە.. کەسـێك کە بـاوەڕی بەم پەروەردگـارە نەبێـت و بە تەواوی لە ڕێ بترازێت، شایانی هیچ شتێکی تری جگە لەو ئاگری دۆزەخە نییە کە بە ڕادەیەك کڵپە دەدات و تووڕە دەبێت کە وەختە لە ڕقدا شەق و پەق ببێت، وەك خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِـنَ الْغَـيْظِ﴾ (الملـك:٨)،

دۆزەخیش بە زمانی حاڵی خۆی دەڵێت: ئەو کەسە شایستەی میهرەبانی نییە و، شایانی سزای هەمیشەیی منە.

❐ وشەی دەهەم: "وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ".

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشـەیەدا هەیە، بـریتییە لەوەی کە:

هەر خاوەن هەست و شعوورێك دێتە ناو ئەم میوانخانەیەی دنیـا و چـاوی دەکاتەوە، "توانست"ێك دەبینێت کە هەموو گەردوونی لە دەستی خۆیدا ڕاگیـر کردووە و، "زانست"ێکی ئەزەلی و ڕەهـای ئەوتـۆش لەم توانستـەدا هەیە کە بە هەڵەدا ناچێت و هیچ شـتێکی لەبیرناچێتەوە و، "دانسـت"ێکی هەتاهەتاییشـی تێدایە کە هەرگیزاو هەرگیـز بێهـوودەیی و هەڕەمەکێتـی تـوخنی ناکەوێـت و، "چاودێری"یەکی لەڕادەبەدەری ئەوتـۆشی لەخـۆ گرتـووە کە هەمـوو دانەیەکی سوپای گەردیلەکان - بە وێنەی جەزبەی موریدی تەریـقەتی مەولەوی - کـێش دەکـات و لە چەنـدین کارمەنـدی و ئەرکی زۆردا دەیانخاتەکـار و، لە هەمـان کاتیشدا "گۆی زەوی" بە ماوەی ساڵێك لە بازنەیەکی فـراوانی بیسـت و چـوار هەزار ساڵیدا دەخاتەگەڕ و بە هەمان یاسـا و بە چەشـنی موریـدێکی شـەیدا و مەجزووبی تەریقەتی مەولەوی هەڵیدەسووڕێنێت و بەڕێوەی دەبات.

هەروەك ئەو "توانستە" داهاتی وەرزەکـان بـۆ گـۆی زەوی و زینـدەوەران و مرۆڤ دەهێنێت، هەر بە هەمان یاسـا و لە هەمـان کاتـدا خـۆریش دەکـات بە مەکووك و چەرخێك و، ئەویش بە وێنەی عاشقێکی حـاڵ و جەزبە لێهـاتوو لە ناوەنـدی مەڵبەنـدی خۆیـدا دەخـولێنێتەوە و، ئەسـتێرە گەڕۆکەکـانیش - کە سـەربازەکانی سـوپای کـۆمەڵەی خـۆرن - بەوپەڕی ڕێکـوپێکی و کەمـاڵی هاوسەنگی لە چەندین خزمەت و ئەرکی مەزن و گەورەدا دەخاتە کار.

هەر "ئەم توانستە" بە هەمان یاسای دانست و لە هەمان کاتدا، سەدان هەزار جۆری ڕووەك و زیندەوەران لەسەر لاپەڕەی سەرانسەری زەویـدا بە جـۆرێکی

تێهەڵکێش و بە بێ هیچ لێتێکچوون و هەڵە و سەهوێك دەنووسێت، کە هەریەکەیان وەك سەدان هەزار کتێب وایە. بەمەش هەزاران نموونەی حەشری گەورە پێشچاو دەخات.

هەر ئەم "توانستە"، لە هەمان کات و چرکەدا، لاپەڕەی "هەوا" دەکات بە تابلۆیەکی کوژانەوە و تیانووسین و، سەرجەمی گەردیلەکانی ئەم هەوایەش وەك نووکی قەڵەم و نوختەکانی ئەو کتێبە لێ دەکات و، لە ناوەندی ئەو سنوورەدا، کە فەرمان و ویستی خوای گەورە بۆی دەستنیشان دەکات، لە چەندین کارمەندی و ئەرکی زۆردا دەیخاتە کار. تەنانەت توانا و لێهاتنێکی ئەوتۆی بۆ وەرگرتن و دانەوەی ئەو وشە و گفتوگۆیانە بە گەردیلەکانی ئەم "هەوا"یە بەخشیوە کە دەڵێی ئەو گەردیلەیە، بێ هیچ هەڵە و لێتێکچوونێك ئاگاداری یەك بە یەکی ئەو وشە و گفتوگۆیانەیە. وەك بڵێی گەردیلەکان چەند وردە گوێیەکی بچووك و وردیلە زمان بن بۆ بیستن و وتنەوەی وشە و گوفتارەکان. ئەمەش دەیچەسپێنێت کە توخمی "هەوا" عەرشێکە بۆ فەرمان و ویستی خوای گەورە!

هەر بە وێنەی ئەم پوختە ئاماژەیە:

ئەو کەسەی کە ئەم گەردوونەی خستووەتە حوکمی شارێکی ڕێکوپێك و کۆشکێکی ئاوەدان و میوانخانەیەکی نایاب و کتێبێکی ئیعجازبەخش و قورئانێکی ڕوون و ڕەوان، ئنجا هەموو چین و بازنە و دەستە و تاقمێکی بەدیهاتووانی هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە کۆی هەموو گەردوون، بە تەرازووی زانست و ڕێسای دانست، لە دەستی توانستی خۆیدا ڕاگیر کردووە و، کاروباریان دەسازێنێت و ڕێکیدەخات و.. لە ناوەندی ئەو توانستە مەزنەشدا دانستە لەڕادەبەدەر و میهرەبانییە فراوانەکەشی دەردەخات و، لە ناوەندی پەروەردگارێتییە ڕەهاکەیدا و بە شێوەیەکی ئاشکرای وەکو خۆری ناوجەرگەی ئاسمان "بوون" و "یەکتایی"ی خۆی بە خاوەن هەستان

دەناسێنێت. لە بەرامبەر ئەم خۆناساندنەشیەوە داوای ئەوە لە بەندەکانی دەکات کە لە ڕێی ئیمانەوە بیناسن و، لە بەرامبەر خۆ خۆشەویستکردنیەوە، ئەوانیش بە پەرستش و عیبادەت خۆیانی لەلا خۆشەویست بکەن و، لە ئاستی نیعمەتەکانیشیدا شوکر و سوپاسی ئاراستە بکەن.

جا ئەو کەسانەی کە ئەم بەخشندە میهرەبانە ناناسن و، لە ڕێی پەرستنیشیەوە هەوڵی ئەوە نادەن کە خۆشیان بوێت، تەنانەت بەرەو ئینکاریکردنی بوونی ئەو بەخشندە میهرەبانە لە ڕێ دەترازێن و، جۆرە دوژمنایەتییەکی ئەو لە ناخی خۆیاندا هەڵدەگرن، ئەوانە - لە ڕاستیدا - چەند شەیتانێکن لە شێوە و ڕوخساری مرۆڤدا و، لە حوکمی چەند نەمرووود و فیرعەونێکی بچووکدان. بێگومان ئەوانە شایانی سزایەکی نەبڕاوەی هەمیشەیین.

❑ وشەی یازدەهەم: "وَإِلَيْهِ الْمَصِيْرُ".

واتە گەڕانەوە هەر بۆ ناو بازنەی حوزوور و جیهانی باقی و خانەی دوارۆژ و مەنزڵی بەختەوەریی هەمیشەیی ئەو دەبێت. هەروەك سەرجەم بەدیهاتووانی گەردوونیش بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە و، زنجیرەی گشت هۆکارەکانیش دەڕۆنەوە سەر توانستی ئەو خواوەندە و پاڵی پێوە دەدەن. چونکە هەموو هۆکارەکان چەند پەردەیەکن لە بەردەم هەڵسوکەوتەکانی ئەم توانستەدا و لەپێناوی پارێزگاریکردنی عیززەت و سام و شکۆ خاوێنەکەیدا دادراونەتەوە. کەواتە هەموو هۆکارە ڕواڵەتییەکان چەند پەردەیەکی ئەوتۆن کە هەرگیز کاریگەرییان لە بەدیهێنانی هیچ شتێکدا نییە. خۆ ئەگەر فەرمان و ویستی خوای گەورە نەبێت ئەوا هیچ شتێك - تەنانەت گەردیلەش - توانای جووڵەی نابێت.

وا ئاماژەیەکی پوخت بۆ ئەو بەڵگەیە دەکەین کە لەم وشەیەدا هەیە و، دەڵێین:

**یەکەم:**

ئەم وشە پیرۆز و خاوێنە، گوزارشت لە حەقیقەتی حەشر و ئاخیرەت و ژیانی باقیی ئەودنیا دەکات..

بۆ چەسپاندن و باوەڕکردن بەم ڕاستییە، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی "وتەی دەهەم" و پاشکۆکانی و "وتەی بیست و نۆهەم" دەکەین کە بە وێنەی بێگومانیی هاتنەدیی بەهاری ئاییندە هاتنەدیی ئەم حەقیقەتە دەچەسپێنن. هەروەها بۆ مەسەلەی حەوتەمی پەیامی "بەری درەختی ئیمان" و "تیشکی موناجات" و بەشە ئیمانییەکانی پەیامەکانی نوور. چونکە بە ڕاستی ئەو پەیامانە بە چەند بەڵگەیەکی لەڕادەبەدەر ئەم پایە ئیمانییەیان چەسپاندووە و، دەریانخستووە کە هاتنەدیی ئاخیرەت بە ڕادە و ئەندازەی دڵنیابوون لە "بوونی دنیا" بێگومان و چەسپاوە و، ئەو پەیامانە تەنانەت سەرسەختترین کەسی ئینکار و ملنەدەریش ناچاری سەلماندن و تەسدیقکردنی دەکەن.

**دووهەم:**

سێیەکی قورئانی پیرۆز لە حەشر و ئاخیرەت دەدوێت و، هەموو دەعواکانیشی لەسەر ئەو حەقیقەتە بنیات دەنێت. لەبەر ئەمە، هەروەك سەرجەمی ئەو موعجیزە و بەڵگانەی قورئانی پیرۆز کە ئەحەقییەتی قورئان دەچەسپێنن، بەڵگەشن لەسەر بوونی دوارۆژ و قیامەت..

بە هەمان جۆر گشت ئەو موعجیزانەی پێغەمبەریش ﷺ کە شایەتن لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتییەکەی و سەرجەمی ئەو بەڵگانەی تریش کە پێغەمبەرێتی و ڕاستگۆییەکەی دەچەسپێنن، هەموویان بەڵگە و شایەتن لەسەر حەشر و ئاخیرەت. چونکە مەزنترین شت کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ لە درێژایی ژیانیدا خەڵکی بۆ لا بانگ کردووە - دوای ئیمان بە خوا - بریتییە لە ئاخیرەت..

هەروەك سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەری بەڕێزیش - دروودیان لەسەر بێت - خەڵكییان بۆ لای ژیانی باقی و هەمیشەیی بانگهێشت كردووە و، مژدەی بەختەوەریی هەمیشەییان بە گرۆی ئادەمیزاد داوە و، بە چەندین موعجیزەی لەژمارەبەدەر و بەڵگەی بەهێزی گومانبڕیش ڕاستیی دەعواكانیان چەسپاندووە.

جا بێگومان سەرجەمی موعجیزاتیان و گشت ئەو دیاردانەش كە بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرێتی و ڕاستگۆییان، لە هەمان كاتدا شایەتیشن لەسەر ئاخیرەت و ژیانی باقیی ئەودنیا، كە گەورەترین و بەردەوامترینی داواكانیان بووە.

بەپێی ئەمانەی باسمان كردن، هەموو ئەو بەڵگانەی كە گشت پایەكانی ئیمان دەچەسپێنن، لە لایەنی خۆیانەوە شایەتیش لەسەر هاتنەدیی قیامەت و كردنەوەی دەرگاكانی خانەی بەختەوەریی هەمیشەیی دەدەن.

**سێهەم:**

بەدیهێنەری ئەم گەردوونە، كە هەموو گەردیلە و هەسارە گەڕۆك و بەش و چینەكانی ئەم گەردوونەی بەدی هێناوە و، بۆ مەبەستی دەرخستنی كەماڵ و توانست و پەروەردگارێتیی خۆی و بە كەماڵی دانایی هەریەكەیانی لە ئەركێك بەڵكو لە چەندین ئەرك و كارمەندیدا بە بەردەوامی خستووەتە كار..

ئەو بەدیهێنەرەی كە كاروان لە دوای كاروانی چینەكانی بەدیهاتووان و تەنانەت چەندین دنیای نوێی یەك لە دوای یەك و بەخوڕەم بۆ ئەم میوانخانەیەی جیهان و ئەم مەیدانی تاقیكردنەوەیەی ژیانی دنیا دەنێرێت، تاكو درەوشانەوە بێسنوورەكان و ناوە جوانە هەمیشەییەكانی خۆی دەربخات و، بۆ ئەوەش كە وێنە و كردار و بارودۆخەكانی ئەو بەدیهاتووانە بە چەندین كامێرای بەرزەخی و فلیمی قیامەتیی جیهانی میسال بگرێت و، پاشان دوای تەسریحكردنیان لە كارەكانی ئەستۆیان، كاروان لە دوای كاروان چینەكانی

تریـان بە دوادا دەنێرێـت.. تەنـانەت جۆرێـك لە دنیـا گەڕۆك و بەخورەكـان دەنێرێتە ئەو مەیدانە، تاكو گەلێ ئەركی مەزن بگرنە ئەستۆیان و بـبن بە ئـاوێنە بۆ درەوشانەوەكانی ناوە جوانەكانی ئەو بەدیهێنەرە..

ئایا دەگونجێت ئەم بەدیهێنەرە جوان و كردگارە مەزن و خواوەنـدە خـاوەن كەماڵە، خانەی سـزا و پاداشـت دانەنێـت و حەشر و نشـوور بـۆ ڕەگەزی ئەم مرۆڤە دانەمەزرێنێت كە لەم دنیا فانییەدا و بە هەست و شعوور و عەقڵی خۆی لە سەرجەم خواست و ئامانجەكانی ئەو بەدیهێنەرە بەخشندەیە تێـدەگات و، بە هەموو توانا و لێهاتنەكانیشی ئەو بەدیهێـنەرەی خـۆش دەوێـت و لای غەیـری خۆیشی خۆشەویستی دەكـات و، دەیناسـێت و دەیناسـێنێت و، بە چەنـدین دوعا و پاڕانەوەی بێسنووریش بۆ بەدەسـتهێنانی بەختەوەریـی هەمیشـەیی نـاو مـانەوەی ئەودنیـا لێـی دەلاڵێـتەوە و، لەبەر ئەو ئـازارە بێسـنوورانەش كە بە ژێـرییەكەی هەسـتیان پـێ دەكـات بە هەمـوو سروشـت و گیـان و توانـا و لێهاتنەكـانیەوە داوای ژیـانی بـاقیی ئەودنیـای لـێ دەكـات كە چێـژ و لەزەتی ڕاستەقینەی تێدایە..

ئایا دەگونجێت ئەم مرۆڤە سزا و پاداشتی بۆ دانەنرێت؟

نەخێر.. هەزار جار نەخێر.

درێـژە و ڕوونكردنەوەكـانی ئەم پـوختە ئامـاژەیە بە جـوانترین شـێوە و بەهێزترین بەڵگەوە لە پەیامەكانی نووردا هەیە. بۆیە ئەم مەسـەلە دوور و درێـژە لێـرەدا بە كـورتی و پـوختی هێـنرا و، خـوێنەری بەڕێـز ڕەوانەی ئەو پەیامـانە دەكەین.

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ (البقرة:٣٢).

* * *

## پوختەیەکی کورت بۆ لێکدانەوەی

## سوورەتی "الفاتحة"

### بەشی دووهەم

ئەم پوختە لێکدانەوەیە هی تەنها یەك وانەیە کە لە قوتابخانەی یووسفیی سێهەم و لە ماوەیەکی یەکجار کەمی دەمی گواستنەوەم لە تەنیایی و زیندانی تاکەکەسیدا بۆ ناو هۆڵی گشتی و تێکەڵاویی خەڵکیدا، ئاراستەی قوتابیانی نوور کرا.

#### نموونەی وانەیەکی یەکجار کەم و کورت کە لە بەندیخانەدا بە قوتابیانی نوور وترایەوە

فاتیحەی نوێژ فەرمانی بە دڵم دا کە یەك دڵۆپ لە دەریاکەی و بریسکەیەك لە ڕێژنەکانی هەر حەوت ڕەنگی خۆرەکەی ڕوون بکەمەوە..

پێشتریش لە بەشێکی مەکتووبی بیست و نۆهەمدا، بە تایبەت لە گەشتە ئەندێشەییەکەی ناو "نوون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ و، لە پەیامی "هەشت هێماکان" و، لە تەفسیری "ئامارژەکانی ئیعجاز" و، بەشەکانی تری پەیامەکانی نووردا گەلێ سەرنجی لەڕادەبەدەر شیرین و جوانمان لە بارەی ئەم گەنجینە بەرز و بڵندەی قورئانەوە نووسیوە.

بەڵام ئێستا لە ڕوویەکەوە ناچار بووم کە تەنها ئەو بیرکردنەوەیە بنووسم کە لە نوێژدا سەبارەت بە ئاماژەکانی ئەو پوختە خاوێن و جوانەی قورئان بە بیرمدا دێت، لەبارەی پایە و بەڵگەکانی ئیمان و پوختەیەکی ئەو ئاماژانە کە - وەك بەشی یەکەم - لەوپەڕی کورتی و پوختیدایە.

وا بە "الْحَمْدُ لِلّٰه" دەست پێ دەکەم و "بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ" بە چەند پەیامێکی نوور دەسپێرم:

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيْمِ

﴿الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ ۝ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيْمِ ۝ مَالِكِ يَوْمِ الدِّيْنِ ۝ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِيْنُ ۝ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيْمَ ۝ صِرَاطَ الَّذِيْنَ أَنعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوْبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّيْنَ ۝﴾. آمين.

❍ وشەی یەکەم: ﴿الْحَمْدُ لِلّٰه﴾.

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگە ئیمانییەی کە لەم وشەیەدا هەیە، بریتییە لەمەی خوارەوە:

مایە و سەرچاوەی دەربڕینی شوکر و سوپاس لەم گەردوونەدا، ئەو نیعمەتانەن کە بە قەسد و ئامانجەوە دەبەخشرێن. بە تایبەت نازدنی شیری پوخت و خاوێن لە نێوان سیخوڕ و خوێنەوە بۆ ساوا و وردیلە و منداڵە دەستەوسانەکان و، چاکە و دیارییە ئیختیارییەکان و، ئەو ڕێزلێنان و میواندارییە میهرەبان و بەسۆزانەش کە سەرانسەری ڕووی زەوییان پۆشیوە و تەنانەت سەرانسەری گەردوونیشیان گرتووەتەوە.

ئەو نرخ و بەهایەش کە لە بەرامبەر ئەم نیعمەتانەوە پێشکەش دەکرێن، وتنی "بِسْمِ اللّٰهِ"یە لە سەرەتا و "الْحَمْدُ لِلّٰهِ"یە لە کۆتاییدا و، لە نێوانیشیاندا

هەستکردنە بە نیعمەتبەخشین لە ناوەندی خودی نیعمەتەکەدا و پاشان گەیشتنی مرۆڤە لەوێوە بە ناسینی پەروەردگاری مەزن.

تۆ هەر بۆ خۆت سەیرێکی زاتی خۆت و گەدە و هەستەوەرەکانت بکە و، بزانە کە هەریەکەیان چەندە پێویستی بە شتی زۆر و نیعمەتی لەڕادەبەدەرە و، چەندەش خوازیار و کڕیاری ڕۆزی و تام و چێژەکانە بە دراوی نرخ و بەهاکانی حەمد و شوکرانەبژێری! ئەمە ببینە و ئنجا لە خۆتەوە بە هەمان چاو سەیری هەموو زیندەوەرێکی تریش بکە.

سەرجەمی ئەو حەمد و سوپاسە نەبڕاوانەی کە لە زمانەکانی حاڵ و گوفتارەکانەوە لە بەرامبەر ئەم هەموو نیعمەتە گشتییانەوە دەردەبڕڕێن و ئاراستە دەکرێن، بە وێنەی خۆری درەخشان پەروەردگارێتییەکی گشتی و، بوونی پەرستراوێکی سوپاسکراو و، نیعمەتبەخشێکی میهرەبان دەچەسپێنن.

○ **وشەی دووهەم: ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾.**

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشەیەدا هەیە، بریتییە لەمەی خوارەوە:

بە چاوی خۆمان هەزاران، تەنانەت ملیۆنان جیهان و گەردوونی بچووك لەم گەردوونە مەزنەدا دەبینین کە زۆربەیان ئاوێتە و تێهەڵکێشی یەکترین. خۆ هەرچەندەش بەڕێوەبردن و هەلومەرجەکانی ڕێکخستنی کاروباری هەریەکەیان لەوانی تر ناچێت، کەچی بەوپەڕی کارگێڕی و پەروەردەکاری و کارسازییەوە بەڕێوە دەبرێن.

کەواتە سەرانسەری گەردوون هەموو کاتێك لە بەردەم بینینی خواوەندی شکۆمەند و گەورەدا وەك لاپەڕەیەکی کراوە و، هەموو جیهانەکانیش وەکو دێڕێك وان کە بە قەڵەمی توانست و قەدەری خوای گەورە لەو لاپەڕەیەدا دەنووسرێن و، بەردەوام نوێ دەکرێنەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دەهێنرێت. ئیتر بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکان و ئەو بوونەوەرانەش کە لێیان پێکدێن و لە

هەمـوو کاتێکـدا، چەنـدین شـایەتیی هەمەکی و جـوزئی دێـنە پـێش لەسـەر پێویستیی "بوون" و "یەکتایی" پەروەردگاری هەموو جیهانەکان، کە ئەم ملیۆنان جیهان و بوونەوەرە بەخوڕەمانە بە پەروەردگارێتییەکی ڕەهای خاوەن زانسـت و دانستی بێسنوور و خاوەن چاودێری و میهرەبانیی فراوانی هەمەلایەنگر، بەڕێوە دەبات.

کەسێك باوەڕ بە پەروەردگارێتییەکی مەزنی ئاوا نەکات کە هەر لە کـێڵگەی گەردیلەکانەوە تا دەگاتە کۆمەڵەی خۆر و بازنەی گەلەستێرەی ڕێی کاکێشان و، لە خـانەی جەسـتەوە تـا دەگـاتە کۆگـای زەوی و سەرانسـەری گەردوون، بە هەمان یاسا و هەمان پەروەردگاری و هەمان دانسـت هەمـوو شـتێك پەروەردە دەکات و کاروباریان دەسازێنێت.. بێگومان کەسـێك کە بـاوەڕ بەمە نەکـات و پەیی پێ نەبات و نەیبینێت، خۆی شـایانی سـزایەکی هەمیشـەیی دەکـات و، سۆز و بەزەیی پێداهاتنەوەش لەدەست دەدات.

❍ وشەی سێهەم: ﴿الرَّحْمٰنِ الرَّحِيْمِ﴾.

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشـەیەدا هەیە، بـریتییە لەوەی کە:

بوونی "میهرەبانیی بێکۆتایی" و حەقیقەتەکەشی، بە وێنەی ڕووناکیی خـۆر بە ڕوونی لەم گەردوونەدا دەبینرێـت. جـا ئەم میهرەبـانییە فـراوانە، بە وێـنەی شـایەتیدانی ڕوونـاکی لەسـەر خـۆر، شـایەتیی بێگومـان دەدات لەسـەر بەخشندەیەکی میهرەبان کە پەردەی غەیبی بەسەر خۆیدا داداوەتەوە.

بەڵـێ، بەشـێکی گرنگـی میهرەبـانی بـریتییە لە "ڕۆزی". چـونکە واتـای "الرَّزَّاق" بە ناوی "الرَّحْمٰن" دەبەخشێت. وەك ڕۆزی - خۆیشی - بە شـێوەیەکی هێنـدە ڕوون بەڵـگەیە لەسـەر "ڕۆزیبەخشـی میهرەبـان" کە هەرکەسـێك بە ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك هەست و شعووری تێدا بێت ناچاری تەسـدیق و باوەڕپێهێنانی دەبێت.

بۆ نموونە:

ڕۆزیدەری میهرەبان بە شێوەیەکی دەراسا ڕۆزیی هەمـوو زینـدەوەران، بە تایبەت دەستەوسانەکانیان، بە تایبەت لەناو ئەوانیشدا ڕۆزیی ساوا و بێچـووان ئامادە دەکات، لە کاتێکدا کە ئەو زیندەوەرانە لە هەموو شوێنێکی سەرانسـەری زەوی و بۆشایی ئاسماندا بڵاوبوونەتەوە. کە ئەمەش کارێکە لە بـازنەی توانـا و ئیختیاری خۆیاندا نییە و، ڕۆزیدەری میهرەبان لە چەند ناوکێکی هاوشـێوە و لە چەند دڵۆپە ئاوێك و چەند دەنکە گڵێك و تەنانەت لە هیچیشەوە بۆیان ئامـادە دەکات. بە ڕادەیەك کە ئەو جووجەڵە و بێچووانەش توانـای فڕینیـان نییە و لە هێلانەی سەر چڵ و لقـی درەختەکانـدان، ڕۆزیـدەری میهرەبـان دایکانیـان بە وێنەی سەربازی ئامـادەی فەرمـان بـۆ ملـکەچ و گـوێڕایەڵ دەکـات و، بەنـاو سـەوزەڵانی و جۆگەلەکانـدا دەگەڕێـن تـاکو ڕۆزی بـۆ ئەو بێچـووانە بهێـنن. تەنانەت دایکەی شێر بۆ بێچووەکەی ملکەچ دەکات و، ئەو پارچە گۆشتەی کە پەیدای کردووە خۆی نایخوات و دەرخواردی بێچووەکەی دەدات! هەروەها لە نێـوان سـیخوڕ و خـوێنێکی چەپەڵەوە شـیرێکی پوخـت و خـاوێن لە ڕێـی سەرچاوەی مەمك و گوانەکانەوە بۆ ساوا و بێچـووانی زینـدەوەران دەنێرێـت، بێ ئەوەی ئەو شیرە تێکەڵ و چەپەڵ ببێت و، شەفەقەتی دایکانیان بۆ دەکات بە پشتگیر و یارمەتیدەر.

ئنجـا هەروەك بە شـێوەیەکی دەراسـا ڕۆزیـی گونجـاو فریـای هەمـوو ئەو درەختانە دەخات کە پێویستیان بە جۆرە ڕۆزیـیەکی تـایبەتی هەیە، ئەو ڕۆزیـیە مـاددی و مەعنەوییـانەش بە هەسـت و نەسـتەکانی ئـادەمیزاد دەبەخشـێت کە پێویستی پێیانە و، سـفرەیەکی یەکجـار فـراوانی ڕۆزیـیش لە بەردەم "ژیـری" و "دڵ" و "گیان"ی ئەم مرۆڤەدا ڕادەخـات، بە ڕادەیەك کە دەڵێـی بـوونەوەران لە سـەدان هەزار سـفرەی نـیعمەتی تێهەڵکـێش و خـواردەمەنیی جۆراوجـۆر پێکهاتوون کە بە وێنەی پەڕە و گەڵاکانی گوڵ و بەرگـی گـلـکی گەنمە شـامی

لەناو یەکتردا و لە تەنیشتی یەکەوە ڕیز بوون. جا کەسێك کە چاوی نابینا نەبووبێت، لەم کارەدا بە ئەندازەی ژمارەی ئەو سفرە ڕاخراوانە و بە قەدەر خواردەمەنییەکانی ناویان زمانی کوللی و جوزئی دەبینێت کە هەموویان دەبن بە شایەت و بەڵگە لەسەر ڕۆزیدەر و بەخشندەی میهرەبان.

**ئەگەر بوترێت:**

ئەو گرفت و شەڕ و ناشیرینییانەی کە لەم دنیایەدا هەن، پێچەوانەی ئەم سۆز و میهرەبانییەن و، ڕوونییەکەی لێڵ دەکەن؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

بەشەکانی پەیامەکانی نوور، بە تایبەت پەیامی قەدەر، بە تێروتەسەلی وەڵامی ئەم پرسیارەیان داوەتەوە. بۆیە خوێنەر ڕەوانەی ئەوێ دەکەین و، لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی پوخت بۆ ئەم وەڵامە دەکەین:

هەموو توخم و هەموو جۆر و هەموو بوونەوەرێك چەندین کارمەندیی هەمەکی و هەندەکیی لە ئەستۆدایە و، هەریەك لەو کارمەندییانەش گەلێ ئەنجام و بەروبوومی زۆریان لێ پەیدا دەبێت و، زۆرینەی ڕەهای ئەو بەروبوومانەش بەرژەوەندییان تێدایە و جوان و خێر و میهرەبانین. بەشێکی کەمیشیان دەبن بە شەڕ و ناشیرینییەکی ڕواڵەتی و ستەم سەبارەت بە کەسانێك کە شایستەییان تێدا نییە و بە هەڵە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، یان ئەوانەی کە شایانی تۆڵە و تەمێکردنن، یان لە شتێکدا کە ببێت بەهۆی گەلێ خێری زۆر و زەبەندە. چونکە ئەگەر "میهرەبانی" ڕێی بەو توخم و بوونەوەرە هەمەکییە نەدایە ئەرکەکەی سەرشانی ئەنجام بدات، بە نیازی ڕێنەدان بە هاتنی ئەو شەڕە هەندەکییە، ئەوا هەموو بەروبووم و ئاکامە خێر و جوانەکانیش نەدەهاتنە دی و، بە ژمارەی ئەو ئاکام و بەروبوومانە شەڕ و ناشیرینی و خراپە پەیدا دەبوو، چونکە نەبوونی "خێر" شەڕە و، شێواندنی "جوانی"ش ناشیرینییە!

بەو واتـایەی کە ئەو کـاتە و لەبەر ڕێـنەدان بە هـاتنەدیی یەك دانە "شـەڕ"، سەدان شەڕ و ستەم و خراپە ئەنجام دەدران. خـۆ ئەوەش بە تەواوەتی دژی ئەو پەروەردگارێتییەی خواوەندە کە خاوەنی دانایی و بەرژەوەندی و میهرەبانییە.

بۆ نموونە:

بەفر، سەرما، ئاگر، باران و، شتانی هاوێنەیان، هەریەکەیان سەدان دانایی و بەرژەوەندییان تێدایە. جا ئەگەر کەسێك لە وانەی گوێ بە کارەکانیـان نـادەن و پشتگوێی دەخەن، بە ئیختیاری خراپ و هەڵەی خۆی خـراپەیەکی بەرامـبەر بە خۆی ئەنجام دا، بۆ نموونە؛ دەستی خستە ناو ئاگر و، پاشان وتی: "بەدیهێنانی ئاگر هیچ خێرێکی تێدا نییە" ئەوا سوود و خێر و میهرەبانییە لەژمارەبەدەرەکـانی ئاگر لەم قسەیەیدا بە درۆی دەخەنەوە و زللـەیەك لە دەموپلی دەسرەوێنن!

پاشان هەست و هەوا و ئـارەزووە نـزمە دواڕۆژنەبینەکـانی مـرۆڤ هەرگیـز ناکرێن بە پێوەر و مەحەك و تەرازوو بۆ هەڵسەنگاندنی یاسـاکانی میهرەبـانی و فەرمانڕەوایی و پەروەردگـارێتی کە لەم گەردوونەدا بەڕێـوە دەچـن، چـونکە لە ناوەنـدی ئەو هەسـت و هەوا و ئـارەزووانە و بەپێـی ڕەنگەکـانی ئـاوێنەکەی، بـوونەوەران دەبیـنن، ئەوەتـا دڵـی تاریـك و بێـبەش لە سـۆز و میهرەبـانی "بـوونەوەران" چـاو بەگریـان و ناشـیرین دەبینێـت و، لە بەرچـاوی ئەودا لە ناوەندی چەندین ستەم و تاریکیدا دەتلێنەوە..

بەڵام ئەگەر تەنها بە چاوی ئیمان بۆی بڕوانێـت، ئەوا وەك ئەوەی حـۆریی بەهەشت حەفتا جۆر پۆشاك دەپۆشێت، ئەویش بوونەوەر لە شێوەی مرۆڤێکدا دەبینێت کە حەفتا پۆشاکی جوان و ڕەنگینی یەك لە سەر یەکی پۆشـیبێت کە بە چاکە و خێر و میهرەبانی دووررابن. هەروەها بەو ڕوانیـنە ئیمانیـیە "بـوونەوەر" دەم بە خەنـدەی میهرەبـانی و ڕووی گەش دەبینێـت و، ڕەگەزی "مـرۆڤ" لەم بوونەوەرەدا بە گەردوونێکی بچووك و هەموو یەکێکی مـرۆڤیش بە جیهـانێکی بچووکتر دەبینێت.

ئیتر لە ناخی دڵ و ڕۆحی خۆیەوە دەڵێت:

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۞ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۞ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾.

❍ وشەی چوارەم: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾.

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشـەیەدا هەیە، ئەمەی خوارەوەیە:

**یەکەم:**

سـەرجەمی ئەو بەڵگـانەی کە ئامـاژە دەکەن و شـایەتن لەسـەر حەشر و ئاخیرەت و لە بەڵگەکانی (وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ)ی کۆتایی بەشی یەکەمی ئەم وانەیەدا باس کراون، بە هەمان جۆر شایەتیشن لەسەر ئەو ڕاستییە ئیمانییە فـراوانەی کە ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ ئاماژەی بۆ دەکات.

**دووهەم:**

وەك لە کۆتایی وتەی دەهەمدا وتراوە:

پەروەردگارێتیی "بەدیهێـنەر"ی ئەم گەردوونە و، میهرەبـانییە فـراوانەکەی و دانستە هەتاهەتایی و، جوانی و شکۆمەندی و کەماڵە ئەزەل و ئەبەدیـیەکەی و، هەمـوو سـیفەتە مەزنە ڕەهاکـانی و، سـەدان نـاوی جـوانیش، هەر هەموویـان داواکاری هاتنەدیی قیـامەتن.. هەروەك قورئـان بە هەزاران ئـایەت و بەڵـگەی خۆی و.. پێغەمبەری سەرورەریش حەزرەتی محەممەد ﷺ بە سـەدان بەڵـگە و موعجیزەی خۆی و.. هەموو پێغەمبەران - دروودی خوایـان لەسـەر بێـت - و سـەرجەم کتێـب و صـوحوفە ئاسـمانییەکان، لە ڕێـی بەڵـگە لەژمـارە بەدەرەکانیانەوە، شایەتی لە سەر ئاخیرەت دەدەن.

جا ئەگەر دوای ئەم هەموو بەڵگە زۆرانە، کەسێك بـاوەڕ بە ژیـانی ئەودنیـا نەهێنێت، ئەوا خۆی دەهاوێتە ناو دۆزەخـێکی مەعنەویـی ئەوتـۆ کە هێشـتا لە دنیادایە کوفر بۆی فەراهەم دەهێنێت و هەردەم دەیبارێنێت بەسەر دڵ و ڕۆحی

ئەودا و، بە ئـازارەوە دەيتلێنێـتەوە و، وەك لە "ڕابەری لاوان"دا ڕوون کـراوەتەوە کاتەکانی ڕابوردوو و داهاتوو، هەروەها بوونەوەرانیش، بە جـودایی و نەمانیـان هەردەم بارانی شەڕ و ئازاری بێسنووری بەسەردا دەبارێنن.

سێهەم: بە هێمای ﴿يَوْمِ الـدِّيْنِ﴾ ئامـاژە بـۆ بەڵـگەیەکی گەورە و بەهێـزی "حەشر" دەکەین..

بەڵام حاڵەتێکی کتوپڕی بوو بە هۆی دواخستنی نووسینی ئەو بەڵـگەیە بـۆ کاتێکی تر. لەوانەشە هەر پێویست بە نووسینی نەمابێـت، چـونکە پەیامەکـانی نوور بە سەدان بەڵگەی بەهێز و گومانبڕ هاتنی بەرەبەیانی حەشر و پەیدابوونی بەهاری زیندووبوونەوەیان بە ئەندازەی بێگومانیی هاتنی ڕۆژ بە دوای شەودا و بەهاریش بە دوای زستاندا، چەسپاندووە.

❍ وشەی پێنجەم: کە بریتییە لە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾.

پێش ئەوەی ئاماژە بۆ ئەو بە ڵـگەیە بکەیـن کە لەم وشـەیەدا هەیە، ئەوەم بە دڵدا هات کە بە پوختی باس لەو گەشتە ئەندێشەییە خـاوەن حەقـیقەتەم بـکەم لەسەر بناغەی ئەو ڕوونکردنەوەیەی کە لە مەکتـووبی بیسـت و نۆهەمـدا هەیە سەبارەت بەو گەشتە، ئەویش بە پوختی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

ڕۆژگارێك لە "موعجیزاتی قورئان"م دەکۆڵییەوە، وەك ئەوەی لە پەیامەکانی نوور، بە تایبەت لە تەفسیری "ئاماژەکانی ئیعجاز" و "هەشت هێماکان"دا ڕوون کراوەتەوە..

لەو کاتەدا کە من سەرقاڵی ئەو لێکـۆڵینەوەیە بـووم، چەنـد مـوعجیزەیەکم سەبارەت بە هەواڵدانی غەیبی لە دوائایەتی سـوورەتی "الفـتح"و، مـوعجیزەی مێژوویی ئایەتی پیرۆزی ﴿الْيَوْمَ نُنَجِّيْـكَ بِبَـدَنِكَ﴾ (یونس: ٩٢) دەسـت کەوت، تەنانەت چەند بریسکەیەکی جیاجیای ئیعجـازم لە وشـەکانی قورئـان و چەنـد سەرنجێکی ئیعجازیی وردیشم لە هەندێ پیتی قورئاندا دۆزییەوە..

ئا لەم کاتەدا و لە دەمی خوێندنی سوورەتی فاتیحەی ناو نوێژدا، پرسیارێك ڕووی لە ڕۆحم کرد، تاکو یەکێك لە موعجیزەکانی (نوون)ی ﴿نَعْبُدُ﴾ و ﴿نَسْتَعِينُ﴾م فێر بکات.

پرسیارەکەش ئەمە بوو:

ئایا بۆچی فەرمووی: ﴿نَعْبُدُ﴾ و ﴿نَسْتَعِينُ﴾. (واتە ئێمە تەنها خوا دەپەرستین و پشت تەنها بە خوا دەبەستین) و، "نوون"ی کۆی کەسی یەکەمی بەکارهێنا و، نەیفەرموو: (أعبُدُ.. أستَعينُ)؟

کتوپڕ لە دەروازەی ئەو"نوون"ەوە دەرگای مەیدانێکی فراوان لە بەردەم ئەندێشەمدا کرایەوە و، تا ڕادەی پلەی "شهوود" نهێنیی مەزنی نوێژی جەماعەت تێگەیشتم و، سوودە زۆرەکانیم بینی و، بە دڵنیاییەوە زانیم کە ئەم بینینە موعجیزەیەکە بۆ خۆی. ئەویش بەم شێوەیە:

لەو کاتەدا کە من لە "مزگەوتی بایەزید" نوێژم دەکرد، لە دەمی وتنی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾دا بینیم کە جەماعەتی نوێژ لەو مزگەوتەدا هەموویان ئەم وشەیە دەڵێن کە من وتم و، بەمەش تەسدیقی دەعواکەی من دەکەن. هەروەها لەم دەعوایەم و لە دوعای ﴿اهْدِنَا﴾شدا هاوبەشیم دەکەن و پشتم دەگرن..

ئا لەم کاتەدا پەردەیەك لە بەردەم ئەندێشەمدا لادرا و، هەموو مزگەوتەکانی ئەستەمبوولم لە بەرچاودا بوو بە یەك "مزگەوتی گەورەی بایەزید" و، هەموو موسڵمانانی ناو ئەو مزگەوتە گەورەیە وەکو من دەیانوت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، بەمەش تەسدیقی دەعواکەی من و ئامینیان بۆ دوعاکەم دەکردا!

هەر لەناوەندی ئەو شێوەیەدا کە ئەوان وەك تکاکارێك بۆ دوعاکەم دەرکەوتن، پەردەیەکی تر لە بەردەم ئەندێشەمدا لادرا.. بینیم کە سەرتاسەری جیهانی ئیسلام شێوەی مزگەوتێکی یەکجار گەورەی لەخۆ گرتووە و، مەککەی موکەڕڕەمە و کەعبەی پیرۆزیش وەکو میحرابی ئەو مزگەوتە هەرە مەزنە

دەنوێنن و، سەرجەمی نوێژکەرانیش لە شێوەی چەند بازنەیەکدا ڕووەو ئەو میحرابە خاوێن و پیرۆزە ڕیزیان بەستووە و، هەموویان وەك من دەڵێن: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۞ اهْدِنَا﴾ و، هەر یەکەیان تەصدیقی هەموو ئەوانی تر دەکات و، بە ناویانەوە دوعا و نزاکان پێشکەش دەکات و، هەموو ئەو نوێژخوێنانە دەکات بە تکاکاری پاڕانەوەکەی.

جا لەم کاتەدا کە بیرم لەوە دەکردەوە ئەو ڕێیەی کۆمەڵێکی هێندە زۆری وەك ئەم کۆمەڵە مەزنە بیگرنە بەر، بێ هیچ گومانێك، ڕێیەکی لار نابێت و، دەعواکەیان ڕاستە و، دەست بە ڕووی دوعاکەشیانەوە نانرێت، تەنانەت شوبهە و گومانی شەیتانەکانیش دەباتە دواوە..

هەر لەم کاتەدا کە من بە شێوەیەکی شهوودی و بینین تەسدیقی سوودە مەزنەکانی نوێژی جەماعەتم دەکرد، پەردەیەکی تر لادرا و، بینیم کە:

سەرجەمی "گەردوون" وەك مزگەوتێکی گەورە وایە و، هەموو جۆرەکانی بوونەوەرانیش سەرگەرمی ئەنجامدانی نوێژێکی جەماعەتی یەکجار گەورەن و، هەریەکەیان نوێژ و تەسبیحاتی خۆی دەزانێت و، بە زمانی حاڵ نوێژێکی تایبەت بە خۆی جێبەجێ دەکات، بە مەبەستی ئەنجامدانی بەندایەتییەکی یەکجار فراوان لە بەرامبەر پەروەردگارێتیی هەمەلایەنگری پەرستراوی شکۆمەندەوە. ئیتر هەر یەك لەو نوێژخوێنانە لە تەوحیددا تەسدیقی هەموو ئەوانی تر دەکات و، چەسپاندنی هەمان ئاکام بەدەست دەهێنێت.

لەو کاتەدا کە ئەم شتانەم دەبینی، یەکسەر پەردەیەکی تر لە بەردەم ئەندێشەمدا لادرا.. بینیم:

هەروەك گەردوون، کە مرۆڤێکی گەورەیە و بە زمانی حاڵ و بە زمانی ئامادەیی و پێویستیی سروشتیی زۆر لە بەشەکانی و، تەنانەت بە زمانی گوفتاری خاوەن هەستانی بوونەوەرانی ناوی دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ

﴿نَسْتَعِينُ﴾ و، بەمەش بەندايەتيی خۆيان لە بەرامبەر پەروەردگارێتیی میهرەبانی بەدیهێنەری خۆیانەوە دەردەخەن.. جەستەی منیش، کە ئەم گەردوونە بچووکەیە، وەك جەستەی هەموو نوێژخوێنێکی تر لەو جەماعەتە یەکجار مەزنەدا بە هەموو گەردیلە و هێز و هەست و نەستێکیەوە و، بە زمانی گوێڕایەڵی و پێویستی و، لە بەرامبەر پەروەردگارێتیی بەدیهێنەریەوە دەڵێت:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾!

بەمەش گوێڕایەڵی و ملکەچیی خۆی بۆ فەرمان و ویستی خوای گەورە دەردەبڕێت..

هەروەها بینیم کە ئەو جەماعەتە بە هەموو گەردیلە و هێز و هەست و نەستێکیەوە و، هەموو ساتێك پێداویستییەکانی خۆی دەخاتە بەردەم چاودێریی بەدیهێنەرە مەزنەکەی و، لە پێش چاوی یارمەتی و میهرەبانییەکەیدا پێشکەشی دەکات.. ئنجا بەوپەڕی سەرسوورمانەوە ئەو نهێنییە بەرزەم بینی کە لە نوێژی جەماعەتدا هەیە و، چاوم بە موعجیزەی جوانی "نوون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ کەوت و، ئەو گەشتە ئەندێشەییەم لای دەرگای ئەو "نوون"ەدا بە ئەمانەت سپارد کە لێیەوە هاتبوومە ژوورەوە و.. وتم: (الْحَمْدُ لِلّهِ) و، هەوڵم دا کە بە زمانی هەرسێ کۆمەڵەکانەوە - کە هاوەڵی گەورە و بچووکم بوون لەو گەشتەدا - بڵێم: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾!

وا ئێستا پێشەکییەکە تەواو بوو. با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، کە ئامارەیەکی پوختە بۆ ئەو بەڵگەیەی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ئامارەی بۆ دەکات:

**یەکەم:**

ئێمە بە چاوی خۆمان لە سەرتاسەری گەردوون بە تایبەت لە سەر زەویدا کارایی و بەدیهێنەرێتییەکی بەسام و شکۆ و بەردەوام لەوپەڕی ڕێکوپێکیدا دەبینین..

هەروەها لە ناوەندی ئەم کارایی و بەدیهێنەرێتییەدا پەروەردگارێتییەکی ڕەها و میهرەبـان و کارسـاز دەبینـین کە بەدەم هـاوار و داوای یارمەتیـدان و دوعـا و پاڕانەوەی بەکردەوە و زمـانی حـاڵ و گوفتـاری چەنـدین زینـدەوەری لەژمـارە بەدەرەوە دەڕوات، بە چەشـنێك کە ئەوپەڕی چـاودێری و کەمـاڵی حـیکمەتی تێدایە..

هەروەهـا لە ناوەنـدی ئەم پەروەردگـارێتی و دیـاردانەی گیرابـوونی دوعـای کردەیـی هەمـوو زینـدەوەرێك بە شـێوەیەکی سـەربەخۆ، درەوشـانەوەی خـوایەتییەکی ڕەهـا و پەرسـتراوییەکی گشـتی دەبینـین لە بەرامـبەر هەزاران بەنـدایەتیی سروشـتی و ئیختیـارییەوە، کە هەمـوو بـوونەوەران بە تـایبەت زیندەوەران، بە تایبەتتر سەرجەم دەستە و بەشەکانی مرۆڤ ئەنجامی دەدەن، کە ئەمەش ژێریی ساغ و ئیمان دەیبینن، هەروەك سـەرجەم کتێبە ئاسـمانییەکان و گشـت پێغەمـبەرە بەڕێزەکـانیش - دروودی خوایـان لەسـەر بێـت - ڕایـان گەیاندووە.

**دووهەم:**

سەرقاڵبوونی هەریەك لەو سێ کۆمەڵەی کە لە پێشەکییەکەدا بـاس کـران و بەو شێوەیەی "نوون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ هـێمای بـۆ کـردن، بە چەنـدین پەرسـتشـی سروشتی و ئیختیاری و چەندین شێوەی جیا جیا و هەموویـان پێکەوە، بە بـێ گومـانی بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی کە ئەو بەنـدایەتییەیان شـوکرانەبژێرییەکە لە بەرامـبەر خـوایەتییەکی پەرسـتراودا و، چەنـد شـایەتییەکی گومـانبڕن لەسـەر پەرستراوێکی خاوێن..

ئنجا هەریەك لەو سێ دەستە و کۆمەڵە نـاوبراوە و، هەریەك لە تـاك تـاك و دانە دانەکانیشیان - هەر لە کۆی گشـتیی گەردوونەوە تـا دەگـاتە گەردیلەکـانی یەك جەستە - هەریەکەیان داواکاریی کردەیـی و زمـانی حـاڵی خـۆی هەیە کە

داوای یارمەتیی لە پەروەردگاری پێ دەکات. هەروەها هەریەکەیان دوعا و نزای تایبەت بە خۆی هەیە، وەك لە هێمای "نوون"ی ﴿نَسْتَعِينُ﴾ەوە دەردەکەوێت..

جا کارکردن بۆ یارمەتیدانی هەریەکەیان و فریاگوزارییان و گیراکردنی دوعاکانیان، شایەتێکی ڕاستە و هەرگیز شوبهە و گومان قبووڵ ناکات لەسەر کارسازێکی بەسۆز و میهرەبان.

بۆ نموونە:

وەك لە (وتەی بیست و سێهەم)دا باس کراوە، گیرابوونی هەر سێ جۆرە دوعاکان کە سەرجەم بوونەوەرانی سەر ڕووی زەوی دەیکەن، بە شێوەیەکی یەکجار دەراسا و بە چەشنێك کە لە حسابدا نەبووە، شایەتییەکی بێگومان دەدات لەسەر پەروەردگارێکی میهرەبان و فریادڕەس.

بەڵێ، هەروەك بە چاوی خۆمان گیرابوونی دوعای هەموو ناوك و تووێك دەبینین کە بە زمانی توانا و لێهاتنی لە بەدیهێنەری دەپاڕێتەوە کە بیکات بە گوڵەگەنم یان درەخت، بە هەمان شێوە ناردنی ڕزق و ڕۆزی بۆ هەموو زیندەوەران دەبینین لەو شتانەدا کە دەستیان پێی ناگات و، پێداویستییەکانیان دەدرێتێ و ئەو داواکارییانەی کە لە دەرەوەی وزە و توانای خۆیاندان و بە زمانی پێویستیی سروشتی لە خوای گەورەی تاك و تەنیا داوای دەکەن، هەموو ئەو دوعا و داواکارییانەیان گیرا دەبێت.

ئەم هەموو دوعاگیرابوون و یارمەتی و بەدەمەوەهاتنانە، بە بێگومانی، شایەتی ڕاستن لە سەر بەدیهێنەرێکی بەخشندەی ئەوتۆ کە سەرجەمی ئەو دوعایانە گیرا دەکات کە لە زمانی پێویستیی سروشتییەوە دەردەچن و پێشکەش دەکرێن، وەك بە چاوی خۆمان دەیبینین.. هەروەها چەندین بوونەوەری بێ هەست و سەیر دەخاتە گەڕ بۆ فریاگوزاری و یارمەتیدانی ئەو زیندەوەرانە لە گونجاوترین کاتدا و بە تەواوترین حیکمەت و دانایی.

جا بە گـوێرە و بە پێـوەری گیرابـوونی ئەم دوو بەشـەی دوعـا، گیرابـوونی دەراسای سەرجەم جۆرەکانی تری دوعا کە بە زمانی گوفتار پێشکەش دەکرێن، بە تایبەت دوعای پێغەمبەران - درووودیان لەسـەر بێـت - و، دوعـای مرۆڤـانی تایبەتمەند، شایەتی لەسەر ئەو بەڵگەی یەکتاییە دەدات کە لە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾دا هەیە.

❍ وشەی شەشەم: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيْمَ﴾.

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشـەیەدا هەیە، ئەمەی خوارەوەیە:

هەروەك کورتترین ڕێ لە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر بـریتییە لە (ڕاسـتە شەقام)..

هەروەك کورتترین هێڵ لە نێوان خاڵێك و خاڵێکی تری دوور لەو بریتییە لە (ڕاستە هێڵی نێوانیان)..

بە هەمان جۆر، ڕاسترین ڕێ لە شتانی مەعنەویـدا و لە ڕێگـا مەعـنەوی و قەلبییەکانیشـــدا کە لە هەموویـــان ڕاســـتر بێـــت بـــریتییە لە (کـــورتترین و ئاسانترینیان)..

بۆنموونە:

سەرجەمی ئەو بەراوردانەی کە پەیامەکانی نوور لە نێوان ڕێگاکانی کـوفر و ئیماندا سازیان داوە، بەوپەڕی بێگومانی ڕوونی دەکەنەوە کە:

ڕێگـــای ئـــیمان و تەوحیـــد، کـــورتترین و ڕاســـترین و ئاســـانترین و ڕاستەشەقامترینی ڕێگاکـانە. بەڵام ڕێـی کـوفر و ئینکـاریکردن تـابڵێی دوور و درێژە و، گەلێ مەترسی و گیروگرفتیشی تێدایە.

جا بێگومان ئەم گەردوونەی کە بە ڕێگایەکی خاوەن ئیستیقامەت و داناییدا دەبرێت بەڕێوە، کە ئەویـش کـورتترین و ئاسـانترین ڕێـیە لە هەمـوو شـتێکدا،

هەرگیز ناگونجێ حەقیقەتی "شیرك" و "كوفر"ی تێدا جێ بێتەوە. کەچی ڕاستییەکانی ئیمان و تەوحید هێندە بۆ ئەم گەردوونە پێویستن کە وەك پێویستیی خۆر وان بۆ جیهان.

هەروەها ئاسانترین و سوودبەخشترین و کورتترین و بێوەیترین ڕێ لەمەڕ خووڕەوشتەکانی مرۆڤ لە ناوەندی ڕاستەشەقام و ئیستیقامەتدایە..

بۆ نموونە:

ئەگەر هێزی "ژیری"ی مرۆڤ ناوەندەسنوور لە دەست بدات، کە بریتییە لەو دانایی و ڕاستەشەقامەی ئاسان و سوودبەخشە، ئەوا بە زیادەڕەوی و کورتبڕی دەکەوێتە نێوان جەربەزەییەکی زیانبەخش و کەودەنییەکی پڕ لە گیروگرفت. ئیتر لە ئەنجامی ئەمەوە و لە ڕێیەکی درێژخایەندا دووچاری گەلێ دەردیسەری دەبێت.

هێزی "توڕەیی" مرۆڤیش گەر ڕێی "ئازایەتی" نەگرێتەبەر، کە ڕاستەشەقام و ناوەندەڕێیە، ئەوا بەهۆی زیادەڕەوییەوە دەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو هەڵەشەیی و خۆسەپاندنێکی زۆر زیانبەخش و ستەمێکی ناشیرین و، بەهۆی کورتبڕیشەوە بەردەبێتەوە بۆ ناو چەندین ترس و بیمی نابەجێ و سەرشۆڕکەر و ئازاربەخش. ئیتر لە ئەنجامی ئەوە و لە ئاکامی هەڵەی گەورەی لەدەستدانی سنووری ڕاستەشەقام، بە ئازارێکی بەردەوامی ویژدانییەوە دەتلێتەوە.

هەروەها ئەو هێزە "شەهوانی"یەش کە لە مرۆڤدا هەیە، ئەگەر ڕێی بێوەیی ڕاستەشەقام و داوێنپاکی ون بکات، ئەوا بەهۆی زیادەڕەوییەوە بەردەبێتەوە بۆ ناو داوێنپیسی و ڕەفتاری نابەجێ و گێچەڵاوی، بەهۆی کورتبڕیش دووچاری سەرکوتکراوی دەبێت. واتە لە چێژ و لەزەتی نیعمەتەکان بێبەش دەبێت و، لە ئاکامی ئەمەشدا بە ئازاری مەعنەویی ئەو نەخۆشییەوە دەتلێتەوە.

بەم جۆرە و بە پێوەری ئەمانەی باس کران، دەردەکەوێت کە"ئیستیقامەت" (واتە ڕاستەشەقام) بەسوودترین و ئاسانترین و کورتترین ڕێیە لە نێوان هەموو

ئەو ڕێیانەدا کە مرۆڤ لە ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتیدا دەیانگرێتەبەر، خۆ ئەگەر مرۆڤ ئەو ڕاستەشەقامە لە دەست بدات و ونی بکات، ئەوا ئەو ڕێگایانەی تر کە ناچار دەبێت بیانگرێتەبەر گەلێ دوور و درێژ و پڕ لە گیروگرفتی زیانبەخش دەبن سەبارەت بەو.

واتە: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيْمَ﴾ دوعایەکی گشتی و بەندایەتییەکی فراوانە، هەروەك ئاماژەیەکە بۆ بەڵگەیەکی تەوحید و، بۆ وانەیەك لە دانایی و فێرکردنی ڕەوشتە بەرزەکاندا.

❍ وشەی حەوتەم: کە بریتییە لە ﴿صِرَاطَ الَّذِيْنَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾.

ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشەیەدا هەیە، ئەمەی خوارەوەیە:

**یەکەم:**

مەبەستی لە ﴿عَلَيْهِمْ﴾ کێن؟!

ئەم ئایەتە پیرۆزە تەفسیری دەکات:

﴿فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِيْنَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّيْنَ وَالصِّدِّيْقِيْنَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِيْنَ﴾ (النساء: ٦٩)..

چونکە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەو چوار دەستەیە ڕوون دەکاتەوە کە لەناو جۆر و ڕەگەزی مرۆڤدا نیعمەتی گرتنەبەری ڕاستەشەقامیان بەدەستهێناوە..

ئەوەتا بە ﴿النَّبِيِّيْنَ﴾ ئاماژە بۆ سەروەریان حەزرەتی محەمەد ﷺ دەکات و، بە ﴿وَالصِّدِّيْقِيْنَ﴾یش بۆ حەزرەتی ئەبوبەکری صیددیق - خوای لێ ڕازی بێت - و، بە ﴿وَالشُّهَدَاءِ﴾یش ئاماژە بۆ حەزرەتی عومەر و عوسمان و عەلی دەکات، خوایان لێ ڕازی بێت.

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەواڵێکی غەیبی ڕادەگەیەنێت و، بریسکەیەکی ئیعجاز پیشان دەدات و، دەریدەخات کە ئەوانەی دوای پێغەمبەر ﷺ دێن:

حەزرەتی صیدیق و، پاش ئەویش حەزرەتی عومەر و عوسمان و عەلی - خوایان لێ ڕازی بێت - دێن و یەك لە دوای یەك خەلافەت دەگرنەدەست و هەرسێکیان شەهید دەبن.

**دووهەم**

ئەم چوار دەستەیەی کە خاوەنی جوانترین ڕەفتار و ڕاستگۆترین و ڕێکوپێکترین کەسانی گرۆی مرۆڤن، بە هەموو توانایەکیان و بە چەندین بەڵگە و موعجیزە و کەرامەت و کەشفیاتی لەژمارەبەدەر، خەڵکیان بۆ لای ڕاستیی "تەوحید" بانگ کردووە و زۆرینەی ئادەمیزادیش هەر لەسەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تەسدیقی دەعواکەی ئەوانیان کردووە..

کەواتە بێگومان دەبێ ئەو ڕاستییە هێندەی بێگومانیی چەسپاویی خۆری ئاسمان بێگومان و چەسپاو بێت.

لەبەر ئەوە، یەکگرتنی ئەم کۆمەڵە زۆرەی هەڵبژاردە باشەکانی گرۆی ئادەمیزاد، کە ڕاستی و دادپەروەریی خۆیان بە سەدان هەزار موعجیزە و بەڵگەی لەژمارەبەدەر چەسپاندووە و، لە بابەتە ئیجابییەکانی وەك "تەوحید" و "پێویستیی بوون"ی بەدیهێنەردا یەکیان گرتوە، خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی هێندە گومانبڕە کە هەموو دوودڵییەك دەباتە دواوە و دەیسڕێتەوە.

بەڵێ، ئەو ڕاستییە مەزنەی کە ئەو چوار دەستە ناوبراوە ئیمانیان پێ هێناوە، کە ڕێکترین و ڕاسترینی ڕەگەزی ئادەمیزادن، کە ئادەمیزادیش لەخۆیدا ئاکامی گرنگی بەدیهێنانی گەردوون و جێنشینی زەوییە و، لە هەموو زیندەوەرانی تر ئامادەیی زیاتری تێدا جەم بووە و لە هەمووشیان پلەی بەرزترە، بگرە ئەو چوار دەستەیە ڕاستگۆترین ڕابەری تەسدیقکراوی نەوەی ئادەم و پێشەوایانن لە کەماڵاتدا..

هەموو ئەوانە، بە یەکدەنگی و یەکگرتن هەواڵی ئەو ڕاستییەیان ڕاگەیاندووە کە ئیمانیان پێ هێناوە و، بە شێوەیەکی بێگومان و بە "حق الیقین" و "علم الیقین" و "عین الیقین" باوەڕیان پێ بووە و، بە ڕادەیەك لێی دڵنیا بوون کە هیچ شتێك ئەو دڵنیاییەیان نەبزوێنێت و، سەرانسەری گەردوون و سەرجەم بوونەوەرانی ناوی دەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەو ڕاستییە..

ئایا ئەو کەسەی کە ئەم ڕاستییە مەزنە نازانێت و ئینکاریی دەکات، تاوانێکی لەسنوور بەدەر ئەنجام نادات؟ ئایا شایانی سزایەکی هەمیشەیی نییە؟

❍ **وشەی هەشتەم: کە بریتییە لە ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوْبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّيْنَ﴾.**

ئەمەی خوارەوە ئاماژەیەکی پوختە بۆ ئەو بەڵگەیەی کە لەم وشەیەدا هەیە:

مێژووی ئادەمیزاد و کتێبە پیرۆزەکانی ئاسمانیش، بە کۆدەنگی و یەکگرتن و پشتبەستنیان بە تەواتور و ڕووداوە هەمەکییە چەسپاوەکان و زانیاری و بینینەکانی ئادەمیزاد و بە شێوەیەکی ڕاشکاو، هەواڵێکی بێگومان و چەسپاومان دەدەنێ کە:

گیرابوونی غەیبی و نائاسایی هەزاران جارەی داواکارییەکانی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - کە خاوەن و ڕێڕەوانی ڕاستەشەقام﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيْمَ﴾ن و، هاتنەدیی خودی خواست و داواکارییەکانیان.. هەروەها داباریی غەزەب وموسیبەتە ئاسمانییەکان بەسەر کافرانی دوژمنانی ئەواندا بە سەدان ڕووداو.. ئەم دیاردەیە بە بێ گومانی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە:

ئەم گەردوونە و ڕەگەزی ئادەمیزاد لە گەردووندا پەروەردگارێکی فەرمانڕەوای دادگەری بەخشندە و خاوەن عیززەت و کارساز و بەڕێوەبەری هەیە کە لە لایەن خۆیەوە ڕزگاری و سەرکەوتن بە چەندین پێغەمبەری بەڕێزی وەك حەزرەتی نووح و ئیبراهیم ومووسا و هوود و صالح - درووودیان لەسەر بێت - لە چەندین ڕووداوی مێژوویی گەورەدا بەخشیوە و، لە هەمان کات و

هەر لە دنیادا چەندین موسیبەتی ئاسمانی و سامناکی بەسەر چەندین هۆز و نەتەوەی کافر و ستەمکاردا لە بەرامبەر تاوانەکانیانەوە باراندووە، چەشنی سەموود و عاد و فیرعەون.

بەڵێ، مێژووی مرۆڤ هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە تا ئێستا دوو تەوژمی گەورە و دوو زنجیرە ڕووداوی دژ بە یەکی بەخۆیەوە دیوە:

**یەکەمیان:** ڕێڕەوانی ڕێبازی پێغەمبەرێتی و ئەهلی صەلاح و ئیمانن کە بەهۆی گرتنەبەری ڕێی ڕاستەشەقام﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ەوە نیعمەت و بەختەوەریی هەردوو دنیایان بەدەست هێناوە..

ئەوەبوو بە ڕەفتاری ڕاست و هەوڵی ڕێك و تەواوی ئەوان جوانیی پێکەوەگونجان و ڕێسا و ڕێکوپێکی و کەماڵی گەردوون دەرکەوت و، لە ئەنجامی ئەمەشدا لوتف و سۆزی پەروەردگاری جیهانیان و بەختەوەریی هەردوو دنیایان بەدەست هێنا و بوون بە هۆکاری ئەوەی کە پلەی مرۆڤ هەتا پلەی مەلائیکەتەکان، تەنانەت بڵندتریش، بەرز ببێتەوە، بگرە هەر لە دنیادا بەهەشتێکی مەعنەوییان بۆ خۆیان و ئەهلی ئیمان بەدەست هێنا، سەرباری بەختەوەریی هەمیشەیی ئەودنیا.. هەموو ئەمانەش بەهۆی نهێنیی ئیمانەوە.

**تەوژمی دووهەم:** ئەوانەن کە ڕێیان ون کردووە و بەهۆی زیادەڕەوی، یان کورتبڕییەوە "زێری"یان کردووە بەهۆی ئەشکەنجە و ئامێری ئازار و، گرۆی مرۆڤیان دابەزاندە چەندین پلەی لە هی ئاژەڵ نزمتر. بەمەش شایستەیی غەزەبی خوایان بەدەست هێنا و، لە سزای ستەمەکانیان هەر لەدنیادا زللەی موسیبەتەکانیان بەسەردا داباری.

جگە لەوەش کە بەهۆی ئەو گومڕاییەی تێی کەوتوون و لە ڕێی ئەو زێرییەی کە پەیوەندیی بە هەموو بوونبەوەرانەوە هەیە، گەردوونیان کردووە بەجێی خەم و ئازار و ماتەمینگایەکی گشتی و قەسابخانەیەکی چەپەڵ بۆ زیندەوەران، کە لە گێژاوی جودایی و نەماندا دەتلێنەوە و، لە دید و ڕوانینی

ئەواندا پشێوی و هەڕەمەکێتی هەموو ئاسۆیەکی گرتووەتەوە. بۆیە هەر لە دنیادا گیان و ویـژدانی مرۆڤـی گـومڕا لە چوارچێـوەی دۆزەخـێکی مەعنەویـدایە و، خۆی شایستەی تۆڵە و ئازارێکی سەختی قیامەت کردووە.

بەم جۆرە، ئەم ئایەتە پیرۆزەی کۆتایی سـوورەتی فـاتیحە: ﴿الَّـذِيْنَ أَنعَمْـتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوْبِ عَلَـيْهِمْ وَلَا الضَّالِّيْنَ﴾ ئەم دوو تەوژمە ڕوون دەکاتەوە.

سەرچاوە و بناغە و ڕابەری سـەرجەمی ئەو بەراوردانەی کە لە پەیامەکـانی نووردا هەن، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە.

جا لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور لە ناوەندی سازدانی سەدان بەراورددا ئەم ئایەتەیان تەفسیر کردووە، ئەوا ڕوونکردنەوەیان بەو پەیامانە دەسپێرین و، لێرەدا تەنها ئەم ئاماژەیەمان پێ سەروزیادە.

❍ **وشەی نۆهەم: بریتییە لە (آمِيْن).**

ئاماژەیەکی یەکجار پوخت بۆ ئەم وشەیە، ئەمەی خوارەوەیە:

مادەم "نوون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ ، ﴿نَسْتَعِينُ﴾ هەر سێ کـۆمەڵە مەزنەکانمـان بـۆ ڕوون دەکاتەوە، بە تایبەت کۆمەڵی یەکتاپەرستانی جیهانی ئیسـلام، بە تـایبەتتر ملیۆنەها نوێژخوێن کە هەموویان لە یەك کاتدا نوێژ ئەنجام دەدەن و، ئەم نوونە دەمانخـاتە ڕیـزی ئەوانەوە و ڕێـیەکی ڕاسـتمان لە بەردەمـدا دەکـاتەوە، تـاکو بەشـێك لە دوعاکـانی ئەوان بەدەسـت بهێنـین و تەسـدیقی ئەوانمـان دەسـت بکەوێت و، لەو ڕووەوە کە ئەوانیش هەمان گوفتار دەڵێنەوە کە ئـێمە دەیڵێـین، جۆرە شەفاعەتێکی ئەوانمان دەست بکەوێت.. ئێمەش بە هەمـان جـۆر کـاتێ دەڵێین: (آمین) پشتی دوعای ئەو نوێژخوێنە یەکتاپەرستانە دەگرین و تەسدیقی دەعواکەیان دەکەین و، بە وشەی "آمین" ئومێدەواری ئەوەیـن کە خـوای گەورە داوای یارمەتی و شەفاعەتی ئەوان گیرا بکات و، بەم کارەش پەرستن و دوعا و داوا جوزئییەکەی خۆمـان دەکەیـن بە پەرسـتن و دوعـا و داوایەکی هەمەکی لە بەرامبەر پەروەردگارێتییەکی هەمەکی و گشتییەوە.

واتە: وشەی "آمین" هەمەکێتییەکی فراوان بەدەست دەهێنێت. تەنانەت دەکرێ بەهۆی برایەتیی ئیمان و یەکێتیی ئیسلام و لە ڕێی چەندین ڕادیۆی مەعنەوی و پەیوەندیی یەکبوونی کۆمەڵێك کە زیاتر لە ملیۆنەها نوێژخوێنی ڕیزبەستووی نوێژ لە مزگەوتی جیهانی ئیسلامدا پێکهاتوون (آمین)ەکەمان ببێت بە ملیۆنەها (آمین)[1].

* * *

(١) بەم جۆرە ئەگەر مرۆڤێکی عەوام شتێکی بە قەدەر ناوکە خورمایەك لەمە دەست بکەوێت، ئەوا ئەو مرۆڤە کامڵەی کە لە لایەنی ڕۆحییەوە پلەی بەرز بووەتەوە هێندەی دارخورمایەك بەشی خۆی وەردەگرێت، هەر کەسەو بەپێی پلەی خۆی. بەڵام کەسێك کە هێشتا پلەی بەرز نەبووەتەوە نابێ لە کاتی خوێندنی فاتیحەدا بە ئەنقەست بیر لەم واتایانە بکاتەوە(*) تاکو ئارامی و دڵنیایی ئەو تێکنەدات. خۆ کاتێ گەیشتە پلەیەکی وا، ئەو واتایانە هەر بۆخۆیان پەیدا دەبن و سەر هەڵدەدەن. (دانەر).

(*) لەبارەی وشەی (بە ئەنقەست) کە لەم پەراوێزەدا هاتووە پرسیارمان لە مامۆستا کرد. وا لە خوارەوەدا دەقی وەڵامەکەیمان نووسییەوە:

بە ناوی قوتابیانی نوور
لە قوتابخانەی یووسفیی سێهەم
(جەیلان)

پێم وایە کە دەکرێ بیر لە واتا بەرز و فراوانەکانی تەحیات و فاتیحە بکرێتەوە، بەڵام نەك بە ئەنقەست و ڕاستەوخۆ، بەڵکو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، چونکە ئەو شتەی کە جۆرە بێئاگاییەك بۆ دڵی مرۆڤ فەراهەم دەهێنێت بیرکردنەوەیەتی لە درێژەی ئەو واتایانە، بەڵام پوختە واتاکانیان بێئاگایی دەڕەوێنێتەوە و پەرستش و پاڕانەوەکەشی ڕووناك دەکاتەوە. ئیتر بەها بەرزەکانی نوێژ و فاتیحە و تەحیات بە تەواوی دەردەکەون.

مەبەستیش لە (خۆ سەرقاڵنەکردن بە ئەنقەست و ڕاستەوخۆ) کە لە کۆتایی بەشی دووهەمدا هاتووە، ئەوەیە کە:

خۆ خەریککردن بە درێژەی خودی ئەو واتایانە، هەندێ جار نوێژ لە بیری مرۆڤ دەباتەوە و لەوانەشە ئارامی و ئامادەیی دڵ تێکبدات. دەنا من لە خۆمدا هەست بە سوودە مەزنەکانیان دەکەم، گەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و بە پوختی بیریان لێ بکەمەوە. (دانەر)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

وَبِهِ نَسْتَعِينُ

## بەشی سێهەم

### لە تەنها یەك دەرس کە لە قوتابخانەی یووسفیدا وترایەوە

**پێشەکی**

بەشی دووهەم بە فەرمانێکی مەعنەویی سوورەتی "فاتیحە"ی نوێژ نووسرایەوە کە لە ڕێژنەی ڕووناکیی وشەی شایەتمانی: "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰهُ" سەرچاوەی گرتبوو..

ئەم بەشی سێهەمەش - کە ناچار بووم بینووسم - سێ هۆکار هەبوون بۆ نووسینیان، کە ئێستا ڕوخسەت نەدراوم ڕوونیان بکەمەوە. بە بێدارکردنەوەیەکی مەعنەویی ڕستەی "أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُوْلُ اللّٰهِ" و، ڕێژنەی نووری ئەو ئایەتەی کە لە کۆتایی سوورەتی "الفتح"دایە و پێنج موعجیزەی دەرخستووە، نووسیم. کە بریتییە لە:

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُوْلَـهُ بِالْهُدَى وَدِيْنِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وكَفَى بِاللّٰهِ شَهِيْداً ۞ مُحَمَّدٌ رَسُوْلُ اللّٰهِ وَالَّذِيْنَ مَعَهُ أَشِدَّآءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللّٰهِ وَرِضْوَاناً سِيْمَاهُمْ فِي وُجُوْهِهِمْ مِنْ أَثَرِ

السُّجُودِ ذٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْئَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوْقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيْظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللّٰهُ الَّذِيْنَ آمَنُوا وَعَمِلُوْا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ (الفتح: ٢٨-٢٩).

درێژەپێدان و ڕوونکردنەوە و بەڵگەکانی ئەم بەشە، بە پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی" دەسپێرم کە لە ناوەندی کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"دا بڵاوکراوەتەوە و، بە "الحزب النوري"ش کە بە زمانی عەرەبی دانراوە.. بەڵام لێرەدا سێ ئاماژەی یەکجار کورت و پوختی بۆ دەکرێت. لە ئاماژەی دووهەم و سێهەمیشدا شتێك دەنووسرێت کە وەك تەرجەمەی تایبەتیی شایەتمانی (مُحَمَّدٌ رَسُوْلُ اللّٰه) بێت لەم پەیامە بچووکەی کە لێرەدا دانراوە و لە "خلاصة الخلاصة"ی "الحزب النوري العربي" وەرگیراوە، کە ئەویش ویردی بەردەوامی منە و، بیرکردنەوەیەکە بە زمانی عەرەبی نووسراوە و، هەردەم لەگەڵ وشەی شایەتمان و لە ناوەندی زیکرەکانمدا دووبارەی دەکەمەوە.

❍ ئاماژەی یەکەم:

ئەم محەممەدەی ﷺ کە بە پەرستشێکی هەمەکی و ناساندنی پەروەردگاری شکۆمەندی خۆی پێشوازیی لە دیاردەکانی پەروەردگارێتیی پەروەردگاری جیهانیان و هەمیشەیی خوایەتییەکەی و نیعمەتە لەژمارەبەدەرەکانی ئەو خوایە کردووە.. ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ، بە ئەندازەی بوونی خۆر بۆ ئەم گەردوونە بوونی ئەویش بۆ گرۆی مرۆڤ پێویستە. چونکە هەر تەنها ئەوە مامۆستای هەرە مەزن و، پێغەمبەری هەرە گەورەی گرۆی ئادەمیزاد و، مایەی شانازیی جیهان و، شایستەی گوفتاری (لولاكَ لولاكَ لما خلقت الأفلاك)[1].

(١) لەسەر "لولاك.. لولاك" زۆر وتراوە، چ لە بارەی سەنەدەوە و چ لەبارەی واتاکەیەوە. لە هەمووی جوانتر وتەکەی (علي القاري)یە کە دەڵێت: "هەرچەند لە سەنەددا لاوازە، بەڵام واتاکەی ڕاستە". بڕوانە: "شرح الشفا لعلي القاري ٦/١".. بۆزانینی ئەوەش کە ئەم وتەیە

هەروەك حەقیقەتی محەممەدی بوو بە هۆی بەدیهێنانی جیهان و، ئاكام و كامڵترین بەروبوومی بەدیهێنانی ئەم جیهانەیە، بە هەمان جۆر و بەهۆی ئەو حەقیقەتە و لەبەر پێغەمبەرایەتییەكەی ئەو، كەماڵاتی ڕاستەقینەی سەرجەمی بوونەوەرانیش دێنەدی. چونكە دەبن بە چەندین ئاوێنەی باقی و هەتاهەتایی بۆ خوای گەورەی خاوەنی جوانی و شكۆمەندی و هەمیشەیی و، سیفەتە شكۆمەند و ئاسەوارە بەنرخەكانی ئەو لە خۆیاندا دەردەخەن كە لە شێوەی كارە سەرتاپا دانستەكانیدایە و.. چەند نامەیەكی ڕەوانی ئەون لە لایەن خۆیەوە ناردوونی و.. هەڵگری جیهانێكی باقی و هەمیشەیین و.. خانەیەكی بەختەوەریی هەمیشەیی و دواڕۆژی هەتاهەتایی ئەوتۆ بەرهەم دەهێنن كە سەرجەمی خاوەن هەست و شعوورەكان تاسەمەندن بۆی. هەموو ئەم ڕاستییانە و ڕاستییەكانی تر، تەنها بە حەقیقەتی محەممەدی و ﷺ پێغەمبەرایەتییەكەی ئەو دێنەدی.

لەبەر ئەوە.. هەروەك ئەم گەردوونە شایەتییەكی گومانبڕی بەوپەڕی هێز و چەسپاوی و دامەزراوی دەدات لەسەر پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ، بە هەمان جۆر، گرۆی ئادەمیزاد و تەنانەت سەرجەمی خاوەن هەستەكان، لە پێشەنگیانەوە جیهانی ئیسلامی، هەر هەموویان پێكەوە شایەتی لەسەر ئەو مژدە بەهێز و درەخشانە دەدەن كە حەقیقەتی محەممەدی و پێغەمبەرایەتییەكەی وەك مژدەیەك ڕایانگەیاندووە. ئەویش مژدەی ژیانی هەتاهەتاییە كە مرۆڤایەتی هەمیشە بە ئەوین و شەوق و حەزێكی بەردەوام و بە زمانی هەموو ئەو هێزانەی لە ماهیەتیدا جەم بوون و بە زمانی توانا و لێهاتنەكانی و بە زمانی سەرجەم دوعا و پەرستش و لاڵانەوە و پاڕانەوەكانی، كە پێشكەشی خوای گەورە و

واتاكەی ڕاستە و خوای گەورە لەبەر پێغەمبەر ﷺ گەردوونی دروست كردووە، بڕوانە: (الفتاوى لإبن تيمية ج ١١/ص٩٦ - ٩٨ مجلد التصوّف). (وەرگێڕ)

بەتوانــای دەکەن، دەپــاڕێنەوە و داوای دەکەن و خوازیــاری ژیــانی بــاقی و هەمیشەیی و ڕزگار بوونن لە نەمان و هەڕەمەکێتــی و ئیعــدامی هەتاهەتــایی و لەناوچوونی ڕەها و تەواوەتی، کە زۆر لە دۆزەخ ترس و ئازاری زیاترە..

ئنجا هەروەك گرۆی ئادەمیزاد شــایەتی لەســەر ئەوە دەدات کە پێغەمــبەری خۆشەویســت ﷺ مــایەی شــانازیی ئــادەمیزادە و بەڕێزتــرین بــوونەوەرانە، بە هەمان جۆر نووسینی کردەوەی خێر و چاکەی ڕۆژانەی سێسەد و پەنجا ملیۆن ئیمانداری هەموو چەرخ و ســەردەمێکیش لە تۆمــاری کــردەوە چاکەکــانی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەدا ﷺ، بەپێی دەستووری (السَّبَبُ كالفاعل)..

هەروەها بەدەستهێنانی پلەوپایەیەکی هێنــدە بەرز لە لایەن ئەم پێغەمــبەرەوە ﷺ کە بەهرەمەندی بەندایەتییەکی هەمەکی و چەندین ڕێــژنەی پەروەردگــاریی ئەوتۆیە کە بە ئەندازەی خواپەرســتیی ســەدان ملیــۆن، بەڵکــو ملیارەهــا کەسی خواپەرستی چاکەکار دەبێت..

ئەمانەش شایەتییەکی یەکجار بەهێزن لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی.

❍ **ئاماژەی دووهەم:**

ئەم بــڕگەیەی خــوارەوە کە هەمیشــە بیــری لــێ دەکەمەوە، یەکێکــە لە ویردەکانم و، ئاماژە بۆ پتر لە بیســت شــایەتی دەکــات لەســەر پێغەمبەرایەتیــی حەزرەتی محەممەد ﷺ. وا ناوەرۆکەکەی بە پوختی و کورتی دەهێنین.

بڕگەکەش ئەمەیە:

(مُحَمَّدٌ رَسُوْلُ اللهِ صَادِقُ الْوَعْـدِ الأَمِـيْنُ بِشَـهَادَةِ ظُهُـوْرِه دَفْعَـةً مَـعَ أُمِّيَّتِـهِ بِأَكْمَلِ دِيْنٍ وَإِسْلامِيَّةٍ وَشَرَيْعَةٍ وَبِـأَقْوَى إِيمَـانٍ وَاعْتِقَـادٍ وَعِبَـادَةٍ وَبِـأَعْلَى دَعْـوَةٍ وَمُنَاجَاةٍ وَدَعَوَاتٍ وَبِأَعمٍّ تَبْلِيْغٍ وَأَتَمِّ مَتَانَةِ خَارِقَاتٍ مُثْمِراتٍ لاَ مِثْلَ لَهَا)[1].

(١) تێبینی: ئەم بڕگانەی کە لەناو ئەم جۆرە کەوانەدان ( ) لە دەقە ئەسڵییەکەدا هەر بە عەرەبی هاتوون. (وەرگێڕ)

❖ **یەکەمین دانە لەو شایەتییانە:**

بەڵگەیەکی پێغەمبەرایەتییە، کە لە یازدە حاڵەتی پێغەمبەرەوە ﷺ سەرچاوەی گرتووە.

بەڵێ، وێڕای ئەوەی کە نەخوێندەوار بووە و فێری نووسین و خوێندن نەبووە، کەچی ئایینێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە عاقڵان و فەیلەسووفانی چواردە سەدەی تووشی سەرسووڕمان کردووە و، پێش هەموو ئایینە ئاسمانییەکان کەوتووەتەوە و، بێ ئەوەی ئەزموونێکی پێشووتری بووبێت بە تەنها یەکجار سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.. کە ئەمەش حاڵەتێکی ناوازە و بێ وێنەیە..

هەروەها ئەو ئایینی ئیسلامەی کە لە گوفتار و کردار و حاڵەتەکانی ژیانی خاوێنی ئەو سەرچاوەی گرتووە و، ڕێنمایی کردنی بۆ سێسەد و پەنجا ملیۆن مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا، بە چەشنێ کە گیانی ئەوانی پەروەردە و دەروونیانی پاکژ و ژیریانی ڕووناك کردووەتەوە و، ئەوانی بەرەو پێشکەوتنی مەعنەوی بردووە.. ئەمەش حاڵەتێکی تری ناوازە و بێ وێنەی ئەوە..

هەروەها شەریعەتێکی هێندە خاوێن و مەزنی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە بە یاسا دادگەرەکانی پێنج یەکی گرۆی ئادەمیزادی لە ماوەی چواردە سەدەدا هێندە بە دادگەرانە بەڕێوەبرد کە پێشکەوتنی ماددی و مەعنەویی بۆ هێنایەدی.. ئەمەش حاڵەتێکی تری ناوازەی ژیانی ئەوە..

هەروەها بە ئیمان و باوەڕێکی هێندە قایم و مەحکەم و توندوتۆڵەوە هاتە مەیدان کە سەرجەمی ئەهلی حەقیقەتی هەموو کاتێك لەو پلە ئیمانییەی ئەو بەهرەمەندی ڕێژنە و بەرەکەت بوون و، پێکەوە و بە یەك دەنگ تەسدیقی ئەوە دەکەن کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە بەرزترین پلە و پایەدایە. ئەمە جگە لەوەی کە هیچ شوبهە و گومانێکی لە دڵی نەیار و دوژمنانی یەکجار زۆری ئەو کاتەدا بەجێ نەهێشت. کە ئەمەش بە ڕوونی دەریدەخات کە پێغەمبەر ﷺ لە هێزی

ئیمانیشدا هاووێنەی نییە و کەسێك نییە کە لە ئیمانی بەرز و هەمەکیی ئەودا لەو بچێت..

هەروەها بەندایەتی و خواپەرستییەکی هێندە مەزنی پیشان داوە کە سەرەتا و کۆتایی تێدا یەکخستووە، بێ ئەوەی چاولێکەریی هیچ کەسێك بکات و، لەمەشدا چاودێریی نهێنیی خواپەرستیی کردووە تەنانەت لە شڵەژاوترین کاتدا. ئیتر بە تەواوترین و ڕێکترین شێوە ئەو خواپەرستییەی ئەنجام داوە. کە ئەمەش حاڵەتێکی تری ناوازەیە..

هەروەها بە چەشنێك لە بەردەم پەروەردگاری بەخشندەی میهرەباندا پاڕاوەتەوە و دوعای ناسك و نیانی کردووە کە هیچ کەسێك تا ئێستا نەگەیشتووەتە پلەی ئەو پاڕانەوە و موناجاتەی ئەو، سەرباری بەدوای یەکدا هاتنی بیروڕاکان و سوود وەرگرتنیشیان لە یەکتری..

بۆ نموونە: هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورەی لە موناجاتی (الجَوْشَنُ الْكَبِيْر)دا کردووە بە تکاکاری دوعا و پاڕانەوەکەی. ئەوەتا بەدیهێنەری مەزنی خۆی بە وەسفێکی هێندە ناوازە وەسف کردووە کە شایانی بێت و، بە چەشنێك ناساندوویەتی کە هەرگیز هاووێنەی نییە..

هەروەها ئەوەش کە هیچ کەسێك لە ناسینی خوادا بەو پلەیە نەگەیشتووەتەوە کە ئەو پێی گەیشتووە، حاڵەتێکی تری بێ وێنە و ناوازەی ئەوە..

هەروەها بەوپەڕی باوەڕ بەخۆبوونەوە خەڵکیی بۆ لای ئایینەکەی بانگ کردووە و، بە ئازایەتی و هەڵمەتێکی ئەوەندە بێوێنە پەیامەکەی گەیاندووە کە ناحەزی و نەیاریی خزم و مام و دەوڵەتە گەورەکانی جیهان و شوێنکەوتەی ئایینە ئاسمانییە پێشووەکان و دوژمنایەتییان بۆ بانگەوازەکەی، هیچ چەشنە ترس و دوودڵییەکیان لە دڵدا دروست نەکرد، بەڵکو تەحەددای هەموو

جیهانیانی کرد و بە سەر هەمووشیاندا سەرکەوت.. ئەمەش حاڵەتێکی تری ناوازەیە..

هەروەها کۆی ئەم هەشت حاڵەتە دەراسا و بێوێنەیە، شایەتییەکی لەوپەڕی بەهێزیدا دەدەن لەسەر ڕاستی و چەسپاویی بانگەوازەکەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ. کە ئەمانەش چەند حاڵەتێکن مەودای دڵنیابوونی لە کارەکەی و، ڕادەی گەرموگوڕی و ئەندازەی باوەڕبوونی پێی و، کەماڵی ڕاستی و دادگەریی ئەم پێغەمبەرە ﷺ دەردەخەن.

لەبەر ئەوە، جیهانی ئیسلام ڕۆژانە و لە هەموو تەحیاتێکی نوێژدا و بە ملیۆنەها زمان، پیرۆزبایی لەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ دەکەن و، دەڵێن:

(السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ)!

بەم کارەش ملکەچیی خۆیان بۆ ئەرکی پێغەمبەرایەتیی ئەو پێشکەش دەکەن و، ئەو مژدەیە پشتڕاست دەکەنەوە کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ سەبارەت بە بەختەوەریی هەمیشەیی لەگەڵ خۆیدا هێناویە و، لە ئاستی ئەو چاکەیەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوە و، ڕێیەکی ڕاستی بەرەو ئەو ژیانە هەمیشەییە کردووەتەوە کە مرۆڤایەتی بە عیشق و سەودایەکی قوڵ و حەز و شەوقێکی سروشتی و یەقین و ئامادەییەکی یەکجار بەهێزەوە بە دوایدا عەوداڵە، جیهانی ئیسلام بە سوپاسگوزاریی زۆر و پێزانینەوە پێشوازیی لێ دەکەن و، دەڵێن: (السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ). ئیتر لەم ڕێیەوە بەخزمەتگەیشتن و چاوپێکەوتنێکی مەعنەویی ئەو زاتە مەزنە دەردەبڕن و، سڵاوی لێ دەکەن و، بە ناوی سێسەد و پەنجا ملیۆن، بەڵکو چەندین ملیار ئیمانداڕەوە، پیرۆزبایی لێ دەکەن.

❖ **دووهەمین شایەتی**، لەو بیست شایەتییە هەمەکییانەی کە گەلێ شایەتیی لەخۆ گرتووە، بریتییە لە:

(وَبِشَهَادَةِ جَمِيعِ حَقَائِقِ الإِيمَانِ عَلَى تَصْدِيقِهِ).

واتە: ڕاستییەکانی شەش پایەکانی ئیمان و هاتنەدی و ڕاستی و دروستییان، شایەتێکی بێگومان دەدەن لەسەر پێغەمبەرایەتی و ڕاستی و دروستیی حەزرەتی محەمـەد ﷺ. چـونکە کەسـێتیی مەعنەویـی ژیـانی پێغەمبەرایەتیـیەکەی و، بناغەی هەموو دەعواکانی و، حەقیقەتی پێغەمبەرایەتییەکەی بریتییە لەو شـەش پایانەی ئیمان. لەبەر ئەوە، سەرجەمی ئەو بەڵگانەی کە هـاتنەدیی ئەو پایـانەی ئیمان دەچەسپێنن، لە هەمان کاتدا بەڵگەشن لەسـەر ئەوەی کە پێغەمبەرایەتیـی حەزرەتی محەممەد ﷺ حەق و ڕاستە و، پشتگیری لێ کراوە.

هەروەك پەیـامی "بەری درەختـی ئـیمان" و، پاشـکۆکانی "وتەی دەهەم" بەڵگەی هەموو پایەکانی ئیمانیان لەسەر هاتنەدیی ئـاخیرەت ڕوون کـردەوە، بە هەمان جۆر یەك بە یەکی پایەکانی ئیمان لەگەڵ بەڵگەکانیاندا بەڵگەشن لەسـەر پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ.

❖ **سێهەمین شایەتیی هەمەکی**، کە هەزاران شایەتیی لەخۆ گرتووە:

(وَبِشَـهَادَةِ ذَاتِـهِ عَلَيْـهِ الصَّـلاةُ وَالسَّـلامُ بِـآلافِ مُعْجِزَاتِـهِ وكَمَالاتِـهِ وَعُلُـوِّ أَخْلاقِهِ).

واتە: پێغەمبەر ﷺ وەك خۆر وایە، هەر خۆی بەڵگەیە لەسەر خۆی!

جا هەروەك پەیامی دەراسای (موعجیزاتی ئەحمەدی) بە چەندین ڕیوایەتی صـەحیح زیـاتر لە سێسـەد مـوعجیزەی ئەوی چەسـپاند، بە هەمـان جـۆر موعجیزەی دووکەرتبـوونی مانـگ بە ئاماژەی پەنـجەیەکی پیـرۆزی ئەو، وەك ڕاشکاویی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ ڕایگەیاندووە..

هەروەها هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پێنج پەنجە پیرۆزەکانیەوە بە وێـنەی پێـنج کانیاو و، تێراوبوونی سوپایەکی تەواوەتی لەو ئاوە و شایەتیدانیان لەسەری، کە ئەمەش بە چەندین ڕیوایەتی صـەحیح و مـوتەواتیر پـێمان گەیشـتووە، وێـڕای ئەوەی کە ئەم ڕووداوە دووجار و لە چەند شوێنێکی تردا دووپات بووەتەوە..

هەروەها هەڵدانی لەوێچێك گڵ بە هەمان دەستی پیرۆز بە سەر و ڕووی سوپای هێرشبەری دوژمندا و ڕۆشتنی ئەو گڵە بۆ ناو چاوی هەموو یەکێکی ئەو دوژمنانە و تێکشکانیان لە دەمی هێرشبردندا، کە ئەمەش واتای ڕاشکاوی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ﴾ ڕایدەگەیەنێت..

هەروەها تەسبیحاتکردنی بەردە وردە لەناو هەمان دەستدا بە شێوەیەکی ئاشکرا و ڕوون، کە ئەمەش بە چەندین ڕیوایەتی صەحیح ڕیوایەت کراوە..

هەروەها موعجیزە ڕوون و ئاشکراکانی تر کە لەو دەستە پیرۆزەوە پەیدابوون و لای زانایانی لێکۆڵەر لە سەدان تێپەڕ دەبن، بەڵکو دەگەنە هەزار و، بە چەندین ڕیوایەتی موتەواتیر و بێگومان هەندێکیان لە کتێبەکانی سیرەت و مێژوودا ڕیوایەت کراون..

هەروەها یەکگرتنی قسەی دۆستان و دوژمنانی لەوەدا کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە لوتکەی ڕەوشت و ڕەفتارە بەرزەکاندایە و[1] یەکگرتنی لێکۆڵەران لەوانەی کە ڕێگاکەی ئەویان گرتووەتە بەر و شوێنپێی ئەویان هەڵگرتووە و بە پلەکانی کەماڵات گەیشتوون و بە "عين اليقين" حەقیقەتیان بەدەست هێناوە، هەموویان بە "حق اليقين" تەسدیقی ئەوە دەکەن کە ڕەوشتە کامڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە لوتکەی پلە بەرزەکاندایە. وەك ئەوەی کە سەرجەم ڕێژنەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لە ئایینەکەی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ و ڕاستییەکانی ئایینی بەرزی ئیسلام سەرچاوەیان گرتووە، بەڵگەن لەسەری..

---

(١) تەنانەت حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - بەوپەڕی ئازایەتییەوە دەفەرموێت: هەرکات لە جەنگدا بکەوتینایەتە سەختی و تەنگانەوە، خۆمان لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ دەشاردەوە و پەنامان بەو دەبرد..

کتێبەکانی مێژووش دەگێڕنەوە کە تەنانەت دوژمنانیشی شایەتیان داوە پێغەمبەر ﷺ هەروەك لە ئازایەتیدا بەو جۆرە بووە، لە هەموو ڕەوشت و ڕەفتارێکی تری بەرزدا لە لوتکە و چڵەپۆپەدا بووە. (دانەر)

بێگومان ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ، هەر بۆ خۆی شایەتییەکی هەمەکی و فراوان و درەخشان لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی خۆی دەدات.

❖ چوارەمین شایەتی کە گەلێ شایەتیی بەهێزی لەخۆ گرتووە:

(وَبِشَهَادَةِ الْقُرْآنِ بِمَا لا يُحَدُّ مِنْ حَقَائِقِهِ وَبَرَاهِينِهِ).

واتە: قورئـانی خـاوەن ئیعجـازی بەیـان، بە ڕاسـتی و بەڵـگە لەژمارەنەهاتووەکانی خۆی، شایەتی لەسەر پێغەمبەرایەتی و ڕاستیی پێغەمبەر ﷺ دەدات.

بەڵێ، قورئانی پیرۆز کە خۆی لەخۆیدا و لە چل ڕووەوە موعجیزەیەکی درەخشانە (وەك پەیامی موعجیزاتی قورئانی چەسپاندوویەتی، کە لە ناوەندی کۆمەڵە پەیامی زولفەقاردا بڵاو کراوەتەوە)..

ئەو قورئانە پیرۆزەی کە چواردە سەدە زەمانی ڕووناك کردەوە و، بە یاسا توندوتۆڵە نەگۆڕەکانی خۆی پێنج یەکی گرۆی ئادەمیزادی بەڕێوەبرد..

ئەو قورئانە پیرۆزەی کە ئەوسا و ئێستاش تەحەددای سەرجەم نەیارانی خۆی کردووە، بە ڕادەیەك کە تا ئێستا هیچ کەسێك پرکێشیی ئەوەی نەکردووە کە تەنانەت بە ئەندازەی یەك دانە سوورەتیش لاسایی قورئان بکاتەوە. بگرە هەر شەش لاکانی هێندە نوورانین کە هەرگیز شوبهە و گومان ئاوێتەیان نابێت و، شەش پلەی گەورەش تەسدیقی ڕاستی و دادگەریی دەکەن و، قورئانێکە - وەك لە پەیامی "الآية الكبرى"(بینینەکانی گەشتیارێك)دا چەسپاوە - پشت بە شەش ڕاستیی توندوتۆڵ و نەبزواو دەبەستێت..

ئەو قورئانەی کە هەموو کاتێك بەوپەڕی حەز و تاسە و ڕێزەوە لەسەر زمانی سەدان ملیۆن کەس دەخوێنرێتەوە و، لە هەموو خولەکێکیشدا بە نووسینێکی بەرز و بڵند لەسەر پەڕەی دڵی ملیۆنان لەبەرکەریدا دەنووسرێتەوە..

ئەو قورئـانەی کە لە شـایەتیدانی ئەوەوە سـەرجەم شـایەتییەکان و ئـیمانی جیهـانی ئیسـلامیش سـەرچاوەی گرتـووە و، سـەرجەم زانسـتە ئـیمانی و ئیسلامییەکانیش لە سەرچاوەکەیەوە هەڵقولاون.

ئەم قورئانە، هەروەك تەسدیقی کتێبە ئاسـمانییەکانی پـێش خـۆی دەکـات، تەسدیقی مەعنەویی سـەرجەم کتێـب و صـوحوفە ئاسـمانییەکانیش بەدەسـت دەهێنێت.

جا ئەم قورئانە مەزنە، بە هەموو ڕاستییەکانی و بەو بەڵگانەشی کە ڕاستی و دروستیی ئەو دەچەسپێنن، شـایەتی لەسـەر ڕاسـتی و پێغەمبەرایەتیـیەکەی ئەم پێغەمبەرە سەروەرە ﷺ دەدات.

❖ **شایەتیی هەمەکی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم و هەشتەم:**

(وَبِشَـهَادَةِ الْجَوْشَـنِ بِقُدْسِـيَّةِ إِشَـارَاتِهِ.. وَرَسَـائِلِ النُّـوْرِ بِقُـوَّةِ دَلائِلِهَـا.. وَالْمَاضِي بِتَوَاتُرِ إِرْهَاصَاتِهِ.. وَالْاِسْتِقْبَال بِتَصْدِيْقِ آلاف حَادِثَاتِهِ).

واتە: هەروەك "الْجَوْشَنُ الْكَبِيْر" کە چ بە ڕاشکاوی و چ بە ئامـاژە، هەزار و یەك نـاوی خـوای گەورەی لەخـۆ گرتـووە و لە ڕوویەکەوە لە قورئـانەوە هەڵقووڵاوە، ئەم پاڕانەوە و موناجاتە دەراسایەی کە زۆر بەرزتـرە لە موناجـاتی هەمـوو ئەو خواناسـانەی کە بە پلەکـانی خواناسـیدا سـەرکەوتوون، حەزرەتی جیبریـل - دروودی لەسـەر بێـت - لە غەزایەکـدا بـۆ پێغەمـبەری ﷺ هێنـا و فەرمووی: زرێپۆش(جەوشن)ەکەی بەرت لاببە و ئەم جەوشـەنە بخـوێنە. جـا ئەو ڕاستییانەی کە ئەم موناجاتە لە خۆی گرتـوون و ئەو وەسـفانەش کە تیایـدا ڕاستەوخۆ ئاراستەی پەروەردگاری مەزنی خۆی کردوون، شایەتێکی ڕاسـت و دروست لەسەر ڕاستی و پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدات..

هەروەها"پەیامەکانی نوور" کە لە قورئـانی پیـرۆز و، لە لایەکی تریشـەوە لە ڕێژنەی "الْجَوْشَنُ الْكَبِيْر" بەهرەمەند بوون، بە هەر سەد و سی پەیامەکەیـانەوە،

یەکێکن لە بەڵگەکان لەسەر پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ. ئەوەتا بە شێوازێکی ژیری و مەنتیقی، سەرجەم ڕاستییەکانی پێغەمبەرێتیی ئەویان چەسپاندووە. تەنانەت ئەو مەسەلانەش کە فەلسەفە لە ئاستیاندا دەستەوسانە و پێی وایە لە ژیرییەوە دوورن، ئەم پەیامانە بەوپەڕی ئاسانی خوێنەرانیان لێ تێگەیاندوون و دەریانخستووە کە هێندە بە لای ژیرییەوە ڕاست و ڕەوایە دەڵێی بە چاو دەبینرێت.

جا ئەم سەد و سی پەیامە، شایەتییەکی هەمەکی لەسەر ڕاستی و پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدەن..

هەروەها "ڕابوردوو"ش شایەتییەکی هەمەکییە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی؛ چونکە ئەو ئیرهاصانەی کە چەند ڕووداوێکی دەراسان و پێش پێغەمبەرێتی ڕوویان داوە و بە موعجیزەی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دادەنرێن کە دوای ڕووداوەکە دێت، لە کتێبەکانی سیرەت و مێژوودا بە چەشنێکی موتەواتیر و بێگومان و لە چەندین ڕووداودا باس کراون. جا ئەم ئیرهاصانە شایەتییەکی ڕاست لەسەر پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدەن. ئەم ئیرهاصانەش چەندین جۆری زۆریان هەیە، لەم شایەتییەی کە لەمەولا دێت هەندێکی ڕوون دەبێتەوە و، بەشێکی تریشی لە کۆمەڵە پەیامی"زولفەقار"دا باس کراون و، بە گێڕانەوەیەکی ڕاست و دروست کتێبەکانی مێژوو ڕیوایەتیان کردووە..

بۆ نموونە: ناردنی باڵندەی ئەبابیل کەمێك پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەردەبارانکردنی سوپای ئەبرەهە کە بۆ ڕووخاندنی کەعبە هاتبوو.. هەروەها دارمانی بتانی کەعبە لە شەوی لەدایکبوونیدا و.. ڕووخانی دیواری کیسرا و.. کوژانەوەی ئاگری مەجووس، کە هەزار ساڵ بوو داگیرسابوو.. هەروەها سێبەرکردنی هەور بۆ پێغەمبەر ﷺ، وەك بوحەیرای ڕەبەن و حەلیمەی سەعدییەی دایەنی هەواڵیان داوە و.. ڕوودانی زۆر کاری تر کە هەواڵی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەدیان ﷺ داوە پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر..

هەروەها"داهـــاتوو" واتە ئەو ڕووداوانەی کە دوای وەفـــاتی پێغەمـــبەر ﷺ هاتوونەتەدی و لە ژیانی پیرۆزیدا هەواڵی ڕوودانیانی داوە، کە ئەمانەش گەلـێ زۆر و جۆراوجۆرن. یەکێـك لەوانە ئەو هەواڵە غەیبییـانەیە کە تـایبەتن بە ئـالی بەیت و، هاوەڵە بەڕێزەکانی و فتووحاتی ئیسلامەوە..

پەیـامی مـوعجیزاتی ئەحـمەدی (کە لەنـاو کـۆمەڵە پەیـامی زولفەقـاردا بڵاوکراوەتەوە) بە ڕیوایەتی ڕاست و دروست هەشتا ڕووداوی چەسپاندووە کە پێغەمبەر ﷺ پێشتر هەواڵی لەبارەیانەوە دابوو، دوایی هەر بەو جۆرە هـاتنەدی. بۆ نموونە: شەهید بوونی حەزرەتی عوسمان - خوای لێ ڕازی بێت - لە دەمی خوێندنی قورئـان لە موصـحـەفی پیرۆزدا و، شـەهید بوونی حەزرەتی حسەین - خوای لێ ڕازی بێت - لە کەربەلا و، فەتحی شام و فارس و ئەسـتەمبووڵ و، پەیـدابوونی دەوڵەتی عەبـاسی و، نەمـان و تیـاچوونی لەســەر دەســتی جەنگیزخان و هۆلاکۆدا و.. موعجیزەکانی تـری هاوچەشـنیان لەو هەواڵـدانە غەیبییـانەی کە لە هەشـتا ڕووداودا دەرکەوتـوون و بە شـێوەیەکی ڕاســت و دروست پێمان گەیشتوون و کتێبەکانی سیرەت و مێژوو باسیان کردوون..

جا ئەم هەواڵدانە غەیبییانەش، بە هەموو جۆرەکانیـانەوە و هاوکـات لەگەڵ چەندین ڕووداوی زۆری تری داهاتوودا، بەڵگەن لەسەر ڕاسـتگۆیی پێغەمـبەر ﷺ. واتە "داهـاتوو" شـایەتییەکی هەمەکی لەســەر پێغەمبەرایەتیـی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدات.

❖ **شـایەتی نـۆهەم و دەهەم و یـازدەهەم و دوازدەهەم، کە ئەم بـڕگەیەی خوارەوە ئاماژەی بۆ دەکات:**

(وَبِشَهَادَةِ الْآلِ بِقُوَّةِ يَقِينِيَّاتِهِمْ فِي تَصْدِيقِهِ بِدَرَجَةِ حَقِّ الْيَقِينْ.. وَالْأَصْحَابِ بِكَمَالِ إِيمَانِهِمْ فِي تَصْدِيقِهِ بِدَرَجَةِ عَيْنِ الْيَقِينْ.. وَالْأَصْفِيَاءِ بِقُوَّةِ تَحْقِيقَاتِهِمْ فِي

تَصْدِيْقِهِ بِدَرَجَةِ عِلْمِ الْيَقِينِ.. وَالْأَقْطَابِ بِتَطَابُقِهِمْ عَلَى رِسَالَتِهِ بِالْكَشْفِ وَالْمُشَاهَدَاتِ بِالْيَقِيْنِ).

یەکێك لەو شایەتییە هەمەکییەی کە شایەتیی ڕاست لەسەر ڕاستی و دادگەریی پێغەمبەر ﷺ دەدات، بریتییە لە:

**شایەتیی نۆهەم:**

شایەتیی ئەو ئالی بەیتەی پێغەمبەرە ﷺ کە پلەی "عُلَمَاءُ أُمَّتِي كَأَنْبِيَاءِ بَنِي إِسْرَائِيْلَ"یان بەدەست هێناوە و، لە سڵاواتی تەحیاتی نوێژدا هاوشانی ئالی ئیبراهیمن - دروودی خوای لەسەر بێت - و، بریتین لە ئەولیا مەزنەکان و دوازدە ئیمامەکان - خوایان لێ ڕازی بێت - کە لە پێشەنگیانەوە ئیمامی عەلی و حەزرەتی حەسەن و حسەینن، خوایان لێ ڕازی بێت و، شێخی گەیلانی و ئەحمەدی ڕەفاعی[1] و ئەحمەدی بەدەوی[2] و، ئیبراهیمی

(١) سەیید ئەحمەدی ڕەفاعی، ناوی تەواوەتیی: ئەحمەدی کوڕی عەلیی کوڕی یەحیای ڕەفاعییە. ساڵی (٥١٢ك) لە گوندێکی سەر بە شاری "واسط"ی عێراق لەدایك بووە و، هەر لەو شارەشدا وانەکانی خوێندووە و، لە ئەدەب و فیقهدا شارەزایی پەیدا کردووە. لە گوندی "ئوم عوبەیدە" لە نێوان واسط و بەسرەدا ژیاوە. ساڵی (٥٧٨ك) کۆچی دوایی کردووە. پێشەوایەکی زاهید بووە و دامەزرێنەری تەریقەتی ڕەفاعییە. بڕوانە: الأعلام ١٧٤/١، جامع كرامات الأولياء ٤٩٠/٢، نور الأبصار ٢٢٠، الطبقات الكبرى ١٤٠/١، وفيات الأعيان ٥٥/١. (وەرگێڕ)

(٢) سەیید ئەحمەدی بەدەوی (٥٩٦-٦٧٥ك/١٢٠٠-١٢٧٦ز) ناوی تەواوی: ئەحمەدی کوڕی عەلیی کوڕی ئیبراهیمی حسەینییە و، بە (ئەبولعەبباسی بەدەوی) ناسراوە. لە وڵاتی میسردا زۆر بەناوبانگە و، لە بنەچەدا خەڵکی شاری (فاس)ە لە وڵاتی مەغریب. زۆر شوێن گەڕاوە و ماوەیەك لە مەککە و مەدینەشدا ماوەتەوە. پاشان کە ڕۆشتووە بۆ میسر "زاهیر شا" خۆی و لەشکرەکەی ڕۆشتوون بۆ پێشوازی لێکردنی و، لە میوانخانەی تایبەتیی خۆی میوانداریی کردووە. ساڵی (٦٣٤ك) سەردانی شام و عێراقیشی کردووە. لە وڵاتی میسردا خەڵکانێکی زۆر شوێنی ڕێڕەوەکەی کەوتوون کە یەکێك لەوانە خودی "زاهیر بیبرس شا" بووە. لە شاری "تەنتا"ی میسر بە خاك سپێرراوە. بڕوانە: (الأعلام ١٧٥/١). (وەرگێڕ)

دەسووقی[١] و ئەبولحەسەنی شازلی[٢] (قَدَّسَ اللّهُ أَسْرَارَهُم) و ئەقتاب و پێشەوا مەزنەکانی هاوچەشنیان، هەموویان بە یەکدەنگی ولە ڕێی باوەڕی دامەزراوی یەقینی و، بەو کەشف و بینین و کەرامەت و ڕابەرایەتییەی لەم نەتەوەیەدا ئەنجامیان داوە، شایەتی دەدەن و، بە ئیمانی دامەزراویشیان تەسدیقی ڕاستی و پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەکەن.

**شایەتیی دەهەم:**

بریتییە لە شایەتیدانی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە لە دوای پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - لە هەموو خەڵکی بەڕێزترن و، پلە و پایەیان بەرز و بڵندترە، ئەوانەن کە دوای ئەوەی بە نووری حەزرەتی محەممەد ﷺ ڕووناك بوونەوە، لە ماوەیەکی کەمدا و وێڕای ئەوەی کە دەشتەکی و نەخوێندەوار بوون، جیهانیان لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا بە "دادگەری" بەڕێوەبرد و، بەسەر دەوڵەتە مەزنەکاندا سەرکەوتن و، بوون بە مامۆستا و سیاسی و فەرمانڕەوای دادگەری نەتەوە پێشکەوتووە خاوەن شارستانێتی و زانست و سیاسەتەکان و، ئەو سەدە و سەردەمەیان گۆڕی بە چاکترین سەدە و چەرخی بەختەوەری..

(١) دەسووقی: (٦٣٣-٦٧٦ك) ناوی تەواوی: ئیبراهیمی کوڕی ئەبولمەجدی کوڕی قورەیشی کوڕی محەممەدە و، خەڵکی "دەسووق"ی وڵاتی میسرە و، بە نەسەب دەگاتەوە سەر حەزرەتی حسەین. یەکێك بووە لە زانایانی فیقهی مەزهەبی شافیعی. پاشتر ڕێبازی تەسەووفی گرتووەتەبەر و گەلێ موریدیش لەم ڕێبازەدا شوێنی کەوتوون و، بە یەکێك لە چوار قوتبەکان دادەنرێت. (وەرگێڕ)

(٢) (شازلی) ناوی: "عەلیی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولجەبار"ە و، لە ساڵی (٥٩١ك) لە گوندێکی ئەفریقیا بە ناوی "شاذلە" لە دایك بووە. پێشەوایەکی زاهید و شێخی تەریقەتی شازلی و دانیشتووی "ئەسکەندەرییە"ی میسر بووە و، خاوەنی ئەو کۆمەڵە ویردەیە کە بە "حزب الشاذلي" ناسراوە. بڕوانە: الأعلام ٣٠٥/٤، جامع كرامات الأولياء ٣٤١/٢، نور الأبصار ٢٣٤. الطبقات الكبرى ٤/٢. (وەرگێڕ)

جا ئەو هاوەڵە بەڕێزانە، دوای لێ وردبوونەوە و سەرنجدانی هەموو حاڵەتێکی حەزرەتی محەممەد ﷺ و، بینینی هێزی موعجیزە زۆرەکانی بە چاوی خۆیان، دەستیان لە دوژمنایەتیی پێشوویان هەڵگرت و وازیان لە ڕێی باوك و باپیرانیان هێنا و، خۆیان و هەموو شتێکی بەنرخیان لەو پێناوەدا بەخت کرد و، ڕۆشتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە، وەك خالیدی کوڕی وەلید و عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و هاوەڵانیان لەوانەی کە باوك و هۆز و تیرەکانیان بەجێهێشت..

جا ئیمانی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە کە دەگاتە پلەی "عین الیقین" شایەتییەکی هەمەکی و ڕاستە لەسەر ڕاستیی حەزرەتی محەممەد ﷺ و حەقتربوونی پەیامەکەی.

**شایەتیی یازدەهەم:**

کە بریتییە لە شایەتیی هەزاران زانای لێکۆڵەر. واتە شایەتیی موجتەهیدان و پێشەوا مەزنەکان و زانایانی لێکۆڵەر کە تێکڕا ناوی ئەصفیا و صددیقینیان لێ نراوە و، شایەتیی فەیلەسووفە زیرەکەکانی وەك ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد کە وێڕای جیاوازیی ڕێبازی هەریەکەیان لەوی تریان، کەچی ئیمانی مەنتیقی و عەقڵییان هێناوە، لەمەشدا پشتیان بە هەزاران بەڵگەی گومانبڕ و دامەزراو بەستووە تا گەشتنە پلەی "علم الیقین".

جا ئیمانی هەموو ئەو کەسانە بە حەزرەتی محەممەد ﷺ و پێغەمبەرایەتییەکەی و ڕاستیی ئەو، هێندە شایەتییەکی هەمەکییە کە مەگەر کەسێك بە تەنیا خۆی زیرەکییەکی هێندەی هەموو ئەوانەی هەبێت دەنا بە کەس پووچەڵ ناکرێتەوە!

پەیامەکانی نوور یەکێکە لەو شایەتە ڕاست و لەژمارەبەدەرانەی ئەم چەرخە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم پەیامانە هەموو ئەو کەسانەی بە بەڵگە بەستەوە

کە ئینکاریی دەکەن و دەمکوت کران، هەوڵیان دا لە ڕێی دادگا و لەخشتەبردنی کارمەندانی ئاسایش و فەرمانگەکانی دادەوە، پەیامەکان بێدەنگ بکەن.

**شایەتیی دوازدەهەم:**

کە بریتییە لە شایەتیی ئەو ئەقتابانەی کە هەریەکەیان بەشێکی گرنگی نەتەوەی ئیسلامیان لە ناوەندی ئەڵقەی دەرس و بازنەی ئیرشادیاندا کۆکردووەتەوە و، بە ڕێنمایی ناوازە و ئاراستەکردنی ڕاست و دروست و کەرامەتی ڕوون و ئاشکرایان موسڵمانانیان بەرەو پێشکەوتنی مەعنەوی بردووە و، لە شوێنی بەڵگەدا پشتیان بە بینین و کەشفیاتی خۆیان بەستووە..

ئەو ئەقتابانەی کە مەردانی هەڵکەوتووی لێکۆڵەر و شوێنکەوتەی ڕاستی و حەقیقەتن، لە دەمی بەرزبوونەوەی ڕۆحییانـدا بە کەشف و کەرامەت ڕاستیی حەزرەتی محەممەد ﷺ و ڕاستیی پێغەمبەرایەتییەکەی ئەویان دیوە و، بۆیان دەرکەوتووە کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە لوتکەی پلەکانی حەق و ڕاستی و دادگەریدایە. شایەتیی وەك یەك و یەکگرتووی هەموو ئەوانە لەسەر پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ ، پشت ڕاستکردنەوە و تەسدیقێکی هێندە بەهێزە کە هەرگیز زامدار ناکرێ، مەگەر کەسێك بە تەنیا خۆی هەموو ئەو پلانەی کەماڵ و ڕەوشتبەرزی بەدەست بهێنێت کە ئەوان بەدەستیان هێنا!

**شایەتیی سیازدەهەم:**

بریتییە لە چوار بەڵگەی گومانبڕ و فراوان و هەمەکی، کە ئەمەی خوارەوەیە:

(وَبِشَهَادَةِ الْأَزْمِنَةِ الْمَاضِيَةِ بِتَوَاتُرِ بَشَارَاتِ الْكَوَاهِنِ وَالْهَوَاتِفِ وَالْعُرَفَاءِ فِي الْأَدْوَارِ السَّالِفِينَ، وَبِمُشَاهَدَةِ بَشَارَاتِ الرُّسُلِ وَالأَنْبِيَاءِ وَبِشَهَادَتِهِمْ وَبِشَارَتِهِمْ عَلَيْهِمُ السَّلامُ بِرِسَالَةِ مُحَمَّدٍ عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ فِي الْكُتُبِ الْمُقَدَّسَةِ).

پوختەی ناوەرۆکی ئەم بڕگەیە لێرەدا ڕوون دەکرێتەوە، بەڵام درێژەپێدانی تەواوەتی و پاڵپشتی ئەم بڕگەیە لە کۆتایی پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی"دایە، کە لە ناوەندی کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"دا بڵاوکراوەتەوە.

ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت:

کەسانی بەناوبانگی گروّی ئادەمیزاد لە کاتی سەردەمە پێشینەکاندا، لە پێشەنگیانەوە پێغەمبەرە بەڕێزەکان - درووودیان لەسەر بێت - و، خواناسان و، کاهینەکان و، هاتیفەکان، بە یەکگرتوویی هەواڵی هاتنی محەممەد پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەرایەتیی ئەویان داوە. ئەم هەواڵانەی کە پێیان دەوترێت "ئیرهاصات" بە چەندین ڕیوایەتی صەحیح و تەنانەت هەندێکیشیان بە ڕیوایەتی موتەواتیر لە کتێبەکانی فەرموودەی پیرۆز و سیرەت و مێژوودا چەندین جار بە ڕاشکاوی دووپات بوونەتەوە. پەیامی"موعجیزاتی ئەحمەدی" لە نێوان ئەو هەزاران ئیرهاصانەدا ئەوانەیان ڕوون کردووەتەوە کە بەهێزترین و چەسپاوترینی ئەو ڕیوایەتانەن. بۆیە خوێنەری بەڕێزیان بۆ لا ڕەوانە دەکەین و، لێرەدا بە ئاماژەیەکی لەوپەڕی کورتی و پوختیدا دەڵێین:

سەبارەت بە هەواڵدانی پێغەمبەرانەوە - درووودیان لەسەر بێت - ئەوا لە نێوان سەدان ئایەتی کتێبە ئاسمانییەکانی وەك تەورات و ئینجیل و زەبووردا، مەکتووبی نۆزدەهەم بیست ئایەتی تایبەت بە پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدی ﷺ بە شێوەیەکی نزیك لە ڕاشکاوی باس کردووە. "حسین الجسر"[1] لە کتێبەکەیدا سەد دانەی لەو ئایەتانە تۆمار کردووە، کە وێڕای

(١) حسين الجسر: لە (تەرابلوس)ی لوبنان لەدایك بووە و لەوێش کۆچی دوایی کردووە. لە نێوان ساڵەکانی (١٢٦١-١٣٢٧ك/١٨٤٣-١٩٠٩ز)دا ژیاوە. خوێندنی لە ئەزهەر تەواو کردووە. کە گەڕاوەتەوە بۆ تەرابلوس یەکەم پیاوی ئەوێ و شاعیر و زانا و فەقیهێکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە. چەند بەرهەمێکی هەیە، بەناوبانگترینیان: (الرسالة الحميدية) و (الحصون الحميدية)یە. بڕوانە: (الأعلام) ٢٥٨/٢. (وەرگێڕ)

دەستکاریی زۆر لەو کتێبانەدا لە لایەن گاور(دیان) و جوولەکەوە، کەچی هێشتا مژدەی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدەن.

سەبارەت بە کاهینەکانیش، لە پێشەنگیانەوە "شیق" و "سەتیح"، ئەوا لە ڕێی جیننی و ڕۆحانییەکانەوە بە چەندین ڕیوایەتی صەحیح و موتەواتیر و بێگومان هەواڵی غەیبییان داوە لەمەڕ هاتنی پێغەمبەر ﷺ و لابردنی دەوڵەتی فارس و نزیکیی سەرهەڵدانی پێغەمبەرێك لە حیجازدا.

کەعبی کوڕی لوئەی کە یەکێکە لە باپیرانی پێغەمبەر ﷺ و، سەیفی کوڕی زی یەزەن لە پادشایانی یەمەن و، توببەع لە پادشایانی حەبەشە و، خواناسانی تری هاوچەشنیان کە ئەولیای سەردەمی خۆیان بوون، بە ڕاشکاوی هەواڵی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەدیان ﷺ داوە و، بە شیعر ڕایانگەیاندووە. تەنانەت یەکێك لەو پادشایانە وتوویەتی: "من خزمەتکردنی محەممەدم لەم پادشایەتییەم پێ خۆشترە". یەکێکی تریان وتوویەتی: "ئەگەر تەمەن دەرفەتم بدات و بەو پێغەمبەرە بگەم دەبمە ئامۆزای". واتە: وەك حەزرەتی عەلی قوربانیم دەدا و دەبوومە پشتیوانی. لە مەکتووبی نۆزدەهەمدا گرنگترین و چەسپاوترینی ئەم هەواڵانە باس کراوە.

بە هەرحاڵ.. ئەو خواناسانە شایەتییەکی ڕاست و بەهێز و هەمەکی لەسەر پێغەمبەرایەتی و ڕاستگۆیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدەن. وەك لە کتێبەکانی سیرەت و مێژوودا ئەم هەواڵانە بڵاو کراونەتەوە.

ڕۆحانییەکانیش کە خۆیان نابینرێن بەڵام دەنگیان دەبیسترێت و بەم دەنگانەش دەوترێت: "هاتیفەکان"، ئەوانیش بە وێنەی خواناسان و کاهینەکان، شایەتییەکی ڕاستی تەواو ڕاشکاو لەسەر پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدەن.

بە هەمان جۆر گەلێ هەواڵدەری زۆر، تەنانەت ئەو ئاژەڵانەش کە بۆ بتەکان سەردەبڕران و، خودی بتەکان و، نووسراوی سەر کێلی گۆڕەکانیش

هەواڵی پێغەمبەرایەتیی ئەویان داوە و، بە زمانی مێژوو شایەتییەکی ڕاستیان لەسەر پەیامەکەی و حەقتربوونی پێشکەش کردووە.

**شایەتیی چواردەهەم:**

بریتییە لە شایەتیی بەهێزی گەردوون، کە ئەم بڕگە عەرەبییە ئاماژەی بۆ دەکات:

(وَبِشَهَادَةِ الْكائِنَاتِ بِغَايَاتِهَا وَبِالْمَقَاصِدِ الإلٰهِيَّةِ فِيهَا عَلَى الرِّسَالَةِ الْمُحَمَّدِيَّةِ الْجَامِعَةِ؛ بِسَبَبِ تَوَقُّفِ حُصُولِ غَايَاتِ الْكَائِنَاتِ وَالْمَقَاصِدِ الإلٰهِيَّةِ مِنْهَا وَتَقَرُّرِ قِيْمَتِهَا وَوَظَائِفِهَا وَتَبَارُزِ حُسْنِهَا وكَمَالِهَا وَتَحَقُّقِ حِكَمِ حَقَائِقِهَا عَلَى الرِّسَالَةِ الإنْسَانِيَّةِ لاسِيَّمَا عَلَى الرِّسَالَةِ الْمُحَمَّدِيَّةِ؛ إذْ هِيَ الْمُظْهِرَةُ وَالْمَدَارُ الأتَمُّ لَهَا، وَلَوْلاهَا لَصَارَتْ هٰذِهِ الْكَائِنَاتُ الْمُكَمَّلَةُ وَالْكِتَابُ الْكَبِيرُ ذُو الْمَعَانِي السَّرْمَدِيَّةِ هَبَاءً مَنْثُوراً مُتَطَايِرَةَ الْمَعَانِي مُتَسَاقِطَةَ الْكَمَالاتِ، وَهُوَ مُحَالٌ مِنْ وُجُوهٍ وَجِهَاتٍ).

پەیامی"الآیة الکبری"سەبارەت بەم بڕگە عەرەبییە، ئەمەی خوارەوەی باس کردووە:

هەروەك ئەم گەردوونە بەڵگەیە لەسەر ئەو بەدیهێنەر و نووسەر و وێنەکێشەی کە دروستی کردووە و بەڕێوەی دەبات و کاری دەسازێنێت و، بە وێنەکێشان و ئەندازەدانان و ڕێکخستن دەستکاریی دەکات، وەك بڵێی گەردوون کۆشکێکی ڕەنگین، یان پەڕاوێکی گەورە، یان پیشانگایەکی جوانی ناوازە، یان پیشانگای دەرخستن و ناوبانگ پێ دەرکردن بێت بۆ ئەو شتانەی کە تیایدایە..

هەروەك ئەم گەردوونەی کە بەم جۆرەیە، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری خۆی، بە هەمان جۆر و بە چەشنێکی بێگومان، داخوازی ئەوەش دەبێت کە کەسێك هەبێت ئەو واتایانە دەرببڕێت کە لەم کتێبە گەورەیەی گەردووندان و،

ئامانجەکانی خواوەنـدیش لە بەدیهێنـانی گەردوونـدا بزانێـت و بەخەڵکیشـیان بڵێـت و، ئەو دانسـتە پەروەردگاریـیـانەش کە لە ئـاڵوگۆڕی گەردوونــدان و ئەنجامی فەرمانبەری و هەڵسـوکەوتەکانی گەردوونـن، بە دەرس بیـانڵێتەوە و، نرخ و بایەخ و کەماڵاتی ئەو شـتانەش لە گەردوونـدا ڕابگەیەنـێ و ئاشـکرایان بکات و، وەڵامی ئەو پرسیارە سامناك و سەرسـووڕهێنانە بـداتەوە کە: ئایـا ئەم بوونەوەرانە لە کوێوە دێن و؟ بەرەو کوێ دەڕۆن و؟ بۆچی نامێننەوە بەڵکو خێرا دەڕۆن و کـۆچ دەکەن؟ هەروەهـا واتاکـانی ئەو کتێـبە گەورەیە لێکبـداتەوە و حیکمەتی ئایەتە گەردوونییەکانی ڕوون بکاتەوە. واتە داخوازی ئەوە دەبێـت کە بانگەوازکارێکی مەزن و ڕاسـتگۆ و مامۆسـتایەکی لێکـۆڵەر و کـارامە، بـۆ ئەم کارانە ببێت.

کەواتە گەردوون لەم ڕووەوە بەڵـگە و شـایەتێکی بەهێـز و گشـتییە لەسـەر ڕاستی و دروستیی ئەم پێغەمبەرە ئەمینەی ﷺ کە بەڕێزترین و بەرزتـرین کەسـە ئەم فەرمانبەری و ئەرکانەی بە تەواوی ئەنجام دابێت و، بەڵگەیە لەسەر ئەوەش کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەڕێزترین و ڕاستگۆترین نێـرراوی پەروەردگـاری هەمـوو جیهانەکانە.

بەم جۆرە، گەردوون شایەتی دەدات و دەڵێت:

"أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُوْلُ اللّٰه".

بەڵـێ، ڕاسـتی و بەهـا و تایبەتکارییەکـانی گـەردوون تەنهـا بەو نـوورە دێنەدی و بەرجەستە دەبن کە حەزرەتی محەممەد ﷺ لەگەڵ خۆیدا هێنـای و، هەر بەو نوورە کارمەندی و ئەنجام و ئەرك و نرخ و بەهای بوونەوەرەکـانی نـاو گەردوون دەزانرێـت و، هەر بەو نـوورەش سەرانسـەری گەردوون دەبێـت بە چەنـد نـامەیەکی ڕەوانی خـوایی و قورئـانێکی بەرجەسـتەی پەروەردگـاری و پیشـانگایەکی بەسـام و شـکۆی ئاسـەوارەکانی خـوای گەورە. چـونکە ئەگەر نـووری پێغەمـبەر ﷺ نەبـوایە ئەوا گەردوون لە ناوەڕۆکیـدا دەبـوو بە

ماتەمینگـایەکی ترسـناك و، وێـرانەیەکی پـڕ لە تـرس و بـیم و، چەنـد شـتێکی تێکەڵوپێکەڵی وەك یەك و، پشێویی یەك لە دوای یەك، کە لە تاریکایی عەدەم و بێمەبەستی و نەمان و لەناوچووندا دەکەوتنە خوارەوە.

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە، تایبەتکاری و کەماڵات و ئاڵوگۆڕە سـەرتاپا دانستەکان و واتا هەمیشەییەکانی گەردوون، بەوپەڕی ڕێزەوە دەڵێن:

(نَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُوْلُ اللّٰه)!

**شـایەتیی پـازدەهەم**، کە گەلـێ شـایەتیی لەخـۆ گرتـووە، بـریتییە لەمەی خوارەوە:

هەمـــوو ئـــاڵوگۆڕ و جموجـــووڵ و وەســـتان و ژیـــان ومردنێـــك و هەڵسوکەوتەکانی تری هاوچەشـنیان کە لە گەردوونـدا بەڕێ دەچـن، تەنهـا بە ویست و فەرمان و هێـزی زاتی خـوای گەورەی (واجـبُ الْوُجُـود)ە کە هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە هەسـارە گەڕۆکەکـان لە ژێـر فەرمـانی ئەودان و، هەر تەنیا ئەو دەستکارییان دەکات و هەڵیاندەسووڕێنێت.

جـا کاروبـارە پەروەردگـاری و ڕەحمانییەکـانی خواوەنـد لە گەردوونــدا، شــایەتی لەســەر پێغەمبەرایەتیــی حەزرەتی محەمــمەد ﷺ دەدەن. ئەم بــڕگە عەرەبییەی خوارەوە ئەم شایەتییە بەرز و بڵندە دەردەبڕێت:

(وَبِشَهَادَةِ صَاحِبِ الْكَائِنَاتِ وَخَلاّقِهَا وَمُتَصَرِّفِهَا عَـلَى الرِّسَـالَةِ الْمُحَمَّدِيَّـةِ؛ بِأَفْعَالِ رَحْمَانِيَّتِهِ وَبِإِجْرَاءَاتِ رُبُوْبِيَّتِهِ؛ كَفِعْلِ الرَّحْمانِيَّـةِ بِـإِنْزَالِ الْقُـرْآنِ الْمُعْجِـزِ الْبَيَانِ عَلَيهِ، وَبِإِظْهَارِ أَنْوَاعِ الْمُعْجِزَاتِ عَـلَى يَدَيْـهِ، وَبِتَوْفِيْقِـهِ وَحِمَايَتِـهِ فِي كُـلِّ حَالاتِهِ، وَبِإِدَامَةِ دِيْنِهِ بِكُلِّ حَقَائِقِهِ، وَبِإِعْلاءِ مَقَامِ حُرْمَتِـهِ وَشَرَفِـهِ وَإِكْرَامِـهِ عَـلَى جَمِيْعِ الْمَخْلُوقَاتِ بِالْمُشَاهَدَةِ وَالْعِيَانِ، وكَفِعْلِ رُبُوبِيَّتِـهِ بِجَعْـلِ رِسَـالَتِهِ شَمْسـاً مَعْنَوِيَّةً لِكَائِنَاتِهِ، وَبِجَعْلِ دِيْنِهِ فِهْرَسْـتَةَ كَـمَالاتِ عِبَـادِهِ، وَبِجَعْـلِ حَقِيْقَتِـهِ مِـرْآةً جَامِعَةً لِتَجَلِّيَاتِ أُلُوهِيَّتِهِ، وَبِتَوْظِيْفِهِ بِوَظَائِفَ ضَرُوْرِيَّةٍ لازِمَةٍ لِوُجُوْدِ الْمَخْلُوقَاتِ

في هٰذِهِ الْكائِنَاتِ كَلُزُوْمِ الرَّحْمَةِ وَالْحِكْمَةِ وَالْعَدَالَةِ وكَضَرُوْرَةِ لُزومِ الْغِذَاءِ وَالْمَاءِ وَالْهَوَاءِ وَالضِّيَاءِ).

درێژەپێدانی ئەم شایەتییە بڵند و گومانبڕ و یەکجار فراوانە، بە پەیامەکانی نوور دەسپێرین و، لێرەدا بە ئاماژەیەکی لەوپەڕی کورتیدا سەیری پوختە واتاکەی دەکەین، کە ئەمەی خوارەوەیە:

لەم گەردوونەدا بە چاوی خۆمان دەبینین کە:

یەکێك لە یاساکانی پەروەردگارێتی، کە بە دادگەری و دانایی و چاودێری بەرێوەدەچێت، بریتییە لە پارێزگاریی چاکەکاران و تەمێکردنی درۆزنە خراپکارەکان. کە ئەمەش لە ناوەندی هەڵسوکەوتە ڕێکوپێکەکانی خوای گەورەدا بە چاوی خۆمان دەیبینین..

یەکێك لە خواستەکانی کارە میهرەبانی و ڕەحمانییەکانی ئەو خوایە:

ناردنی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیانە بۆ سەر حەزرەتی محەممەد ﷺ و.. دەرخستنی چەندین جۆر موعجیزەی زۆرە کە دەگەنە هەزار موعجیزە لەسەر دەستی و.. پاراستنی پێغەمبەرە ﷺ لە هەموو بارودۆخێکی ژیانی، تەنانەت لە مەترسیترین بارودۆخەکانی ژیانیدا لە ژێر باڵی میهرەبانیی بەشەفەقەتی خوای گەورەدا، تەنانەت پاراستنی بە کۆتر و جاڵجاڵۆکە و.. پشتگرتن و سەرخستنیەتی لە ئەرکەکانی سەرشانیدا و.. بەردەوامکردنی ئایینەکەیەتی بە هەموو ڕاستییەکانیەوە و.. تاج لەسەرنانی زەوی و گرۆی ئادەمیزادە بەو ئیسلامەی کە ئەو هێنای و.. بەرزکردنەوەی شەرەف و پلە و پایەی ئەوە بۆ بڵندترین پلەکان و.. فەزڵدان و پێشخستنیەتی بەسەر هەموو بوونەوەراندا بەوەی کە پلە و پایەیەکی مایەی ڕەزامەندی و بەردەوام و قبوولکراوی پێ بەخشیوە، کە لە سەرووی پلەی هەموو مرۆڤە بەرز و بەڕێزەکانی ئادەمیزادەوەیە و.. بەخشینی کەسایەتییەك بەم پێغەمبەرە ﷺ کە بە یەکدەنگیی

دۆستان و دوژمنانی جوانترین ڕەوشـتە بەرز و بەنرخەکـانی لەخـۆ گرتـووە، بە ڕادەیەك کە پێنج یەکی گرۆی مرۆڤی کردووە بە ئوممەتی ئەو! هەمـوو ئەمـانە، شایەتییەکی ڕاست و بێگومان لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرایەتیی ئەو دەدەن.

هەروەهـا لە ڕووی کـار و فەرمانەکـانی پەروەردگـارێتیی خـوای گەورەوە، دەبینین کە هەڵسووڕێنەر و کارسازی ئیشوکارەکانی ئەم جیهانە، پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەدی ﷺ کردووە بە خۆرێکی مەعنەوی بۆ گەردوون.

ئەوەتا لە پەیامەکانی نووردا چەسپاوە کە:

خـوای گەورە بە پێغەمبەرێتیـی ئەم سـەروەرە ﷺ هەمـوو تاریکییەکـانی ڕەواندەوە و.. ڕاستییە نوورانییەکانی ئاشکرا کرد و، سەرجەم خاوەن هەسـت و شـعوورەکان و، تەنـانەت سەرانسـەری گەردوونی بە مـژدەی ژیـانی بـاقی و هەمیشـەیی دڵخـۆش و شـادمان کـرد و.. ئـایینەکەی ئەوی کـرد بە پێڕسـتی کەماڵاتی هەمـوو بەنـدە وەرگیراوەکـانی و، ڕێبـازێکی ڕاسـت و دروسـت بـۆ کارەکـانی بەنـدایەتی و.. بە بەڵـگەی قورئـانی پیـرۆز و "الجوشـن الکبیـر" حەقیقـەتی محەممەدیشـــی - کە کەسـایەتیی مەعنەویـی ئەوە - کـردووە بە ئاوێنەیەکی گشتی بۆ تێداجەمبوونی درەوشانەوەکانی خوایەتیی خۆی..

تەنانەت زیاد لەو ڕاستییانەی کە ئاماژەمان پێدان، پلەیەکی پێ بەخشـیوە کە هەمـوو ڕۆژێـك و بە درێژایـی چـواردە سـەدەی ڕەبەق هـاووێنەی کـردەوە چاکەکانی هەموو نەتەوەکەی بە دەسـت بهێنێـت و.. بـۆ لای هەمـوو گـرۆی ئادەمیزاد ڕەوانەی کـردووە و چەنـدین کارمەنـدی و ئەرکی مەزن و بەرزی پـێ سپاردووە و.. کردوویەتی بە باشترین پێشـەنگ و مەزنـترین ڕابەر و بەڕێزتـرین گەورەی سەرجەمی مرۆڤایەتی، ئەمەش بە بەڵگەی جێدەست و ئاسـەوارەکانی لە ژیـانی کـۆمەڵایەتی و مەعنەویـی مرۆڤایەتیـدا و.. سـەرجەمی گـرۆی مرۆڤیشـی پێویسـت و موحتـاجی ئـایین و شـەریعەتەکەی و ئەو ڕاسـتییانەی

ئیسلام[١] کردووه کە ئەو بۆی هێناون، بە ئەنـدازەی پێویـستییان بە میهرەبـانی و دانایی و دادگەری و خۆراك و هەوا و ئاو و ڕووناکی..

هەمـــوو ئەو بەڵـــگە هەمەکی و گومـــانبڕانەی کە دەگەنە دوازدە بەڵـــگە، شایەتییەکی بەرز و بڵندن لەسەر پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ.

جـا ئایـا دەگـونجێ پێغەمبەرێتیـی ئەم سـەرووەرە خـۆری مەعنەویـی ئەم گەردوونە نەبێت، لە کاتێکدا ئەم ژمـارە زۆرە شـایەتییە هەمەکی و فـراوانەی لە لایەن پەروەردگــاری جیهـــانیانەوە بەدەســـت هێنــاوە، کە پەروەردگــارێکە چـاودێری و ڕێکخسـتنی هـیچ شـتێك، تەنـانەت بـاڵی مێشـێك و گـوڵێکی بچکۆلەش پشتگوێ ناخات؟!

* * *

(١) لەو کاتەدا کە لەناو پیری ولاوازیـی خۆمـدا دەتـلامەوە، هەسـتم بە یەك لە ملیـۆنی ئەو ڕۆزییە مەعنەوییانە کـرد کە ئەم پێغەمـبەرە بەڕێـزە "حەزرەتی محەمـمەد" ﷺ لەگەڵ خۆیـدا هێناونی. خۆ ئەگەر لە توانامدا ببوایە بە ملیۆنەها زمان و سڵاوات سوپاسـم پێشکەش دەکرد. ئەویش بەم جۆرە:

من گەلێ ئازاری لەڕادەبەدەر لە جودایی و نەمان دەچێژم، لە کاتێکدا کە ئەو دنیایەی خۆشم دەوێت و کەسانی ناویشی بە کۆچکردن و جوداییان بەجـێم دەهـێڵن و، دەزانـم خۆیشـم بە هەمان جـۆر کـۆچ دەکەم. لەمەوە نائومێـدییەکی ئـازاربەخش و ڕەش دامـدەگرێت. بەڵام بە گوێڕاگرتن لە مژدەی بەختەوەریی هەمیشـەیی و ژیـانی هەتاهەتـایی لە لایەن ئەم پێغەمـبەرە بەڕێزەوە ﷺ دڵی خۆم دەدەمەوە و بە تەواوەتی لەو نائومێدییە ڕزگارم دەبێت..

تەنانەت کاتێك لە تەحیاتدا دەڵێم: (السلام علیك أیها النبي ورحمة الله وبرکاتـه) بەیـعەت و گوێڕایەڵی و ملکەچـوونی خـۆم بـۆ ئەرکی سەرشـانی ئەو دەردەبـڕم و لە کارمەندییەکەیـدا پیرۆزبـایی لـێ دەکەم و جـۆرە سوپاسـێکی پێشـکەش دەکەم، لە بەرامـبەر ئەو مـژدەی بەختەوەریی هەمیشەییە کە لەگەڵ خۆیدا هێنای. هەموو موسڵمانانیش ڕۆژانە پێنج جـار بەم سڵاو لێ کردنە هەمان شت دەڵێن و دەری دەبڕن. (دانەر)

هەریەك لەم پازدە شایەتییانە، گەلێ شـایەتیی یەکجـار زۆر لەخـۆ دەگـرن، تەنـانەت شـایەتیی سـێهەم بە بێگومـانییەکی تەواوەتی و هێـزێکی تونـدوتۆڵی دامەزراو دەعوای (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُوْلُ اللّٰهِ)ی چەسپاند. چـونکە بە زمـانی موعجیزات هەزار شایەتی لە ژێر ئەو شایەتیی سـێهەمەدا ڕیزیـان بەسـتووە و، هاتنەدیی نرخ و بەها و گرنگیی مەزنی ئەم دەعوایەی ڕاگەیانـدووە، بە ڕادەیەك کە سەدان ملیۆن زمان لە درێژایی و پانتایی جیهانی ئیسـلامدا هەمـوو ڕۆژێـك پێنج جار ئەم دەعوایە بە گوێی گەردووندا دەدەن!

هەروەك ملیارەها کەسی ئیماندار، بە بێگومانی تەسدیقی ئەوەیان کردووە و بەوە ڕازی بوون کە بناغەی ئەو دەعوایە - کە حەقیقەتی محەممەدیـیە - تـۆوی ئەسـڵیی درەختـی.گەردوون و، هـۆی دروسـتکردنی پێشـکەوتووترین بەروبـوومیەتی و، پەروەردگـاری جیهانیـانیش ئەو کەسـایەتییە مەعنەویـیە محەممەدییەی کردووە بە:

بانگەوازکـارێکی بەرز و بڵنـد کە خەڵـکی بەرەو دەسـتەڵاتداریی پەروەردگارێتیی ئەو بانـگ دەکـات و، ڕوونـکەرەوە و شـیکەرەوەیەکی ڕاسـتی گرێکوێرەی بوونەوەران و مەتەڵی بەدیهێنان و، نموونەیەکی درەخشانی سۆز و میهرەبانییەکەی و، زمانێکی ڕەوان بۆ دەربڕینی شەفەقەت و خۆشەویستیی ئەو پەروەردگـارە و، مەزنـترین مـژدەدەری بەدیهـاتنی ژیـانی هەتاهەتـایی و بەختەوەریی هەمیشەیی لە جیهانی باقی ونەمریـدا و، دواهەمـین ڕەوانەکـراوی خۆی و، گەورەترین پێغەمبەرانی، دروودی خوای لەسەر بێت.

دەسـا زەرەرمەنـدی بـۆ ئەو کەسـەی بـاوەڕ بە ڕاسـتییەك ناهێنێـت کە ئەم ماهییەتەی لەخۆ گرتووە و متمانەی پێ ناکات، یان بایەخی پێ نادات!

دەسـا بـزانە کە هەڵەیەکی چەنـدە گەورە و گەلحـۆیی و تـاوانێکی چەنـدە مەزنی ئەنجام داوە.

جا هەروەك سوورەتی "فاتیحه"ی نوێژ، بەو ئامـاژانەی لە بەشی دووهەمـدا باس کران، چەندین بەڵگەی گومانبڕ لەسەر دەعوای ڕاستیی تەوحید لە (أَشْهَدُ أنْ لا إلٰهَ إلاّ اللّٰه)دا ڕوون دەکەنەوە و چەندین نیشـانەی بێسـنووری تەسـدیقی لەسەر دادەنێن، بە هەمان جۆر ئەم بەشی سێهەمەش چەنـدین شـایەتیی بەهێـز دەهێـنن کە تەسـدیقی (أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً رَسُـوْلُ اللّٰـه)ی تەحیـات دەکەن و، چەندین نیشانەی بێسنووری تەسدیقی لەسەر دەنەخشێنن.

دەسا ئەی خوای گەورەی لە هەموو میهرەبانێك میهرەبانتر!

بـۆ خـاتری ئەم پێغەمـبەرە بەڕێـزەت ﷺ، بـۆ بەدەسـتهێنانی شـەفاعەتی و شوێنکەوتنی سونەتی خاوێنی ئەو یارمەتیمان بدە و، لە خـانەی بەختەوەریـی هەمیشەییدا لە هاوسێیەتیی ئال و هاوەڵە بەڕێزەکانیدا بمانحەوێنەرەوە.

ئامین.. ئامین..ئامین.

اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ بِعَدَدِ حُرُوْفِ الْقُرْآنِ الْمَقْرُوْءَةِ وَالْمَكْتُوْبَةِ.

آمين.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إنَّكَ أنْتَ الْعَلِيْمُ الْحَكِيْمُ﴾.

* * *

# مەقامی دووهەمی

## (بەڵگەی درەخشان)

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

وَبِهِ نَسْتَعِينُ

تەنها یەك ڕاستیی دواهەمین ئایەتی سوورەتی "فاتیحە" ئاماژە بـۆ بەراورد لە نێوان ڕێڕەوانی ڕێی هیدایەت و ڕاستەشـەقامدا و ڕێـی گـومڕایی و لە سـنوور لاداندا دەكات. هەر هەمان ئـایەت سـەرچاوەی هەمـوو ئەو بەراوردانەیە كە لە پەیامەكانی نووردا ساز دراون. ئەم ئایەتەی خـوارەوەی سـوورەتی (النـور)یش ئەو بەراوردە بە ڕوونی و بە شـێوازێكی سەرسـووڕهێنەر ڕوون دەكـاتەوە و، بە دەربڕینێكی ئیعجازبەخش گوزارشتی لێ دەكات:

﴿اللّهُ نُورُ السَّمٰوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُوْرِهِ كَمِشْكٰوةٍ فِيْهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّها كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوْقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ..﴾ (النور: ٣٥).

ئایەتەكەی دوای ئەویش:

﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ﴾ (النور: ٤٠).

یەکەم ئایەت، واتە ئایەتی نوور، بە دە ئاماژە ڕووی لە پەیامەکـانی نـووره و بۆیان دەڕوانێت و، وەك لە تیشکی یەکەمـدا چەسـپێنراوە هەواڵـێکی ئاینـدەیی ئیعجازبەخش سەبارەت بەو تەفسیرەی قورئانی پیرۆز ڕادەگەیەنێت.

جا لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە گرنگترین هۆکاری ناونانی ناوی (النور)ە لە پەیامەکانی نوور و، لەسەر بناغەی ڕوونکردنەوەی موعجیزەیەکی مەعنەویی ئەم ئـایەتە مەزنە، وەك لەو گەشـتە ئەندێشـەییە چیـرۆك ئاسـایەی بەشـێکی مەکتووبی بیست و نۆهەمدا بۆ ڕوونکردنەوەی موعجیزەی "نوون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ باس کراوە، ئەوا هەر ئەو گەشتیارەی کە لە پەیامی "بینینەکـانی گەشـتیارێك"دا گەشتی بە ناو دنیادا دەکرد و لە دەمی گەڕانی بە دوای بەدیهێنەریدا پرسیاری لە هەموو بوونەوەران و جۆرەکانی کرد و، پاشان بەدیهێنەری خـۆی دۆزیـیەوە و، بە سی و سێ ڕێگە و بەڵـگەی بەهێـزی گومـانبڕ و بە "علـم الیقـین" و "عـین الیقین" خوای خۆی ناسی، هەر ئەو گەشتیارە - بـێ ئەوەی مانـدوو ببێـت - بە ژیری و دڵ و ئەندێشـەی، گەشـتێکی بەنـاو چینەکـانی چەرخەکـان و زەوی و ئاسمانەکاندا کرد، تەنـانەت تـا ئێسـتاش بـۆ ئەوەی تینـوویەتیی نـاخی خـۆی بشـکێنێت لە گەشـتەکەیدا هەر بەردەوامە و، وەك کەسـێك بە نـاو شـارێکدا بگەڕێت گەشتی بە ناو هەموو شوێن و لایەنێکی ئەم دنیا فراوانەدا کردووە.

لەم گەشتەشیدا لە ڕێی ژیرییەوە هەندێ جـار پشـتی بە دانسـتی قورئـان و هەنـدێ جـاری تـر بە دانسـتی فەلسـەفە دەبەسـت و، بە دووربینـی ئەندێشـە دوورترینی چینەکانی دەردەخست، هەتا سەرجەمی ڕاسـتییەکانی وەك واقیعـی ڕاستەقینەی خۆیان بینی و، هەواڵی هەندێکیشـیانی لەو پەیـامەی " بینینەکـانی گەشتیارێك"دا ڕاگەیاند.

وا ئێمەش زۆر بە پوختی تەنهـا سـێ دانە لەو جیهـان و چیـنە زۆرانە ڕوون دەکەیـنەوە کە ئەو گەشـتیارە لە گەشـتێکی ئەندێشـەییدا ڕۆشـتە ناویـان و، هەرچەنـد لە شـێوە و واتـای چیرۆکـدا دەرکەوتـوون بەڵام خـودی ڕاسـتی و

حەقــیقەتن. ئەم جیهانــانەش تەنهــا لە ڕووی هێــزی ژیــرییەوە وەك چەنــد نموونەیەك دەهێنینەوە بۆ ئەو بەراوردەی کە لە کۆتایی سوورەتی "الفاتحة"دایە.

بەڵام بینین و بەراوردەکانی تری ئەو گەشتیارە بەو بەراوردکارییانە دەسپێرین کە لە پەیامەکانی نووردا ساز دراون.

◆ **نموونەی یەکەم:**

ئەو گەشتیارەی کە تەنها بۆ ئەوە هاتە دنیا کە بەدیهێنەری خۆی بدۆزێتەوە و بیناسێت، بە ژیریی خۆی وت:

لەبارەی بەدیهێنەرمانەوە پرسیارمان لە هەموو شتێك کـرد و وەڵامـی تێـر و تەسەلمان وەرگـرت، بەڵام وەك پەنـدێك دەڵێـت: "دەبێـت پرسـیاری خـۆر لە خـودی خـۆر بکرێـت" ئەوا دەبـێ گەشـتێکی تـر ئەنجـام بـدەین بـۆ ناسـینی بەدیهێنەرمان لە ڕێی درەخشانیی سیفەتە مەزنەکانی خـۆیەوە، وەك: "زانسـت و ویسـت و توانسـت" و، لە ڕێــی ئاسـەوارە ناوازەکـانی و، ڕەنگـدانەوەی نـاوە جوانەکانی لە گەردووندا.

بۆ ئەم مەبەستە ڕۆشـتە نـاو دنیـا و یەکسـەر بە وێـنەی ئەو گومڕایـانەی کە تەوژمێکی تر دەنوێنن، سواری کەشتیی زەوی بوو، چـاویلکەی ئەو زانسـت و فەلسەفەیەشی کردە چاو کە پابەندی قورئان نین و، لە پشت چاویلکەی ڕێبازی ئەو جوگرافیایەی کە ڕێنمایی لە قورئان وەرناگرێت سەیری زەوی کرد.. بینیی:

زەوی لە بۆشاییەکی بێسـنووردا گەشـت دەکـات و لە مـاوەی سـاڵێکدا بە خێراییەك کە حەفتا جـار لە خێرایـی گوللەتـۆپ زیـاترە بـازنەیەك دەبڕێـت کە دەگاتە بیست و چوار هەزار سـاڵ ڕێ و، سـەدان هەزار جـۆری زینـدەوەرانی دەستەوسان و لاوازی لەسەر شانی خۆی هەڵگرتووە. خۆ ئەگەر تەنها بـۆ یەك خولەك ڕێی خـۆی ون بکـات، یـان بەر ئەسـتێرەیەکی وێـڵ بکەوێـت، ئەوا لە بۆشـاییەکی بێسـنووردا هەپـروون هەپـروون دەبێـت و زینـدەوەرە لاوازەکـانی سەرنشینی خۆی لەناو نەمان و بێمەبەستی و لەناوچووندا ڕۆ دەکات.

ئیتر ئەو گەشتیارە هەستی بە چەندین تاریکایی مەعنەوی و ترسناك و خنكێنەر كرد، بە وێنەی چینە تاریكەكانی دەریایەكی پڕ شەپۆل. ئەم هەستەشی لەم تێگەیشتنەیدا لە تەوژمی ﴿الْمَغْضُوْبِ عَلَيْهِمْ﴾ و ﴿الضَّالِّيْنَ﴾ەوە سەری هەڵدابوو. بۆیە لە ناخی خۆیەوە وتی: بە داخەوە! چیمان كرد؟ بۆچی سواری ئەم كەشتییە ترسناكە بووین؟ چۆن خۆمانی لێ دەرباز بكەین؟

ئیتر چاویلكەی ئەو فەلسەفە كوێرەی فڕێ دا و شكاندی و، ڕۆشتە ناو تەوژمی ﴿الَّذِيْنَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ەوە. یەكسەر هەستی كرد كە دانستی قورئان فریای دەكەوێت و چاویلكەیەك بە ژیریی ئەو دەسپێرێت كە بە تەواوەتی ڕاستی و حەقیقەت ڕوون دەكاتەوە و، ئەم دانستەی قورئان بەو گەشتیارەی وت: ئێستا بڕوانە.. ئەویش سەیری كرد و بینیی:

ناوی "ربّ السَّمٰوَات وَالأَرْض" لە بورجی ئایەتی پیرۆزی: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوْا فِي مَنَاكِبِهَا وكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ﴾ (الملك: ١٥) هەڵهاتووە و، گۆی زەویی كردووە بە كەشتییەكی ئەمین و بێوەی كە بە ڕێكوپێكییەكی ورد بەناو دەریای فراوانی گەردووندا دەڕوات و، لەبەر چەندین دانایی زۆر و سوودی جۆراوجۆر بە دەوری خۆردا دەسوورێتەوە و، پڕە لە زیندەوەران و ڕزق و ڕۆزیی پێویستیان و، داهاتی وەرزەكان لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەو زیندەوەرانە دەهێنێت كە پێویستیان بە ڕۆزییە و، خوای گەورە دوو مەلائیكەتی بە ناوی "گا و نەهەنگ" داناوە بە كەشتیوانی ئەو كەشتییە، ئیتر ئەوانیش بە گەشتێك لەناو ئەو وڵاتە پەروەردگارییەی كە لەوپەڕی سام و شكۆ و جوانیدایە ئەم كەشتییە بەڕێ دەخەن، تاكو بەدیهاتووانی میوانی بەدیهێنەری گۆی زەوی لە بۆشایی ئەم گەردوونە فراوانەدا گەشتوگوزار بكەن.

بەم جۆرە، حەقیقەتی: ﴿اللّٰهُ نُوْرُ السَّمٰوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئەم گەشتە بە سام و شكۆیە ڕوون دەكاتەوە، چونكە بە درەوشانەوەی ئەم ناوە بەدیهێنەری زەوی دەناسێنێت.

دوای ئەوەی گەشتیارەکە لە بینینەکانی بەناو زەویدا لەم واتایە تێگەیشت و هەستی پێکرد، لە ناخی گیان و هەناوی خۆیەوە ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْن﴾ی دووپات کردەوە و، ڕۆشتە ناو ڕیزی دەستەی: ﴿الَّذِيْنَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾.

◆ **نموونەی دووهەم** لەو جیهانانەی کە ئەو گەشتیارە بینیی، ئەوەیە کە:

دوای ئەوەی لەو گەشتەدا کەشتیی زەویی بەجێ هێشت، ڕۆشتە ناو جیهانی مرۆڤ و زیندەوەرانەوە. لەوێ بە چاویلکەی ئەو دانستە سروشتییەی کە ژیان و گیان لە ئایین وەرناگرێت، سەیری مرۆڤ و زیندەوەرانی کرد، بینیی:

چەندین پێویستیی بێسنووری زیندەوەرانی لەژمارەبەدەر و چەندەها دوژمنی زۆر و زەبەندە دەورەندەوری ئەو زیندەوەرانەیان داوە و ئازاریان دەدەن و، لە چەندین ڕووداوی دژواری بێ بەزەییانەدا زیانی گەورەیان پێ دەگەیەنن و، ئەو زیندەوەرانەش یەك لە هەزار، بەڵکو یەك لە سەد هەزاری دەستمایەی پێویست نەبێت هیچ دەستمایەیەکی تریان لە بەرامبەر ئەو پێویستییە بێسنوورانەوە نییە و، بەرامبەر بەو کاروبار و شتە زیانبەخشانەش تەنها یەك لە ملیۆنی توانای پێویست شك دەبەن!

ئیتر گەشتیارەکە لەبەر ئەو هەست ناسکی و شەفەقەتەی لە بەرامبەر هاوڕەگەزی مرۆڤی خۆیەوە هەستی پێ دەکرد و، لەبەر بیرکردنەوەی ژیریی لەم دیاردەیە، ئازارێکی زۆری سەبارەت بەم بارودۆخەی زیندەوەران چەشت کە لاواندنەوە و ترس و ئازار لە ناخدا دەورووژێنن. بۆیە خەم و ئازارێکی هێندە زۆری بۆ خواردن کە بە وێنەی سزای سەختی دۆزەخ هەستی بە ئازاری نائومێدی دەکرد، گەلێ پەشیمانیی دەربڕی لەوەی کە هاتە ناو ئەم جیهانە خەمناك و ناخۆشەوە.

هەر لەو کاتەدا کە بەم ئازارانەوە دەتلایەوە، دانـایی قورئـانی پیـرۆز فریـای کەوت و چاویلکەی ﴿الَّذِيْنَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ی پێ سپارد و، پێی وت: بڕوانە. ئەویش کە بەو چاویلکەیە ڕوانیی، بینیی:

هەریەك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە، وەك (الرحمٰن، الرحيم، الـرزاق، المُـنعم، الكـريم، الحفـيظ) بە چەشـنی خـۆری درەخشـان و، بە هەڵهـاتن و دەرکەوتنی ﴿اللّٰهُ نُـوْرُ السَّـمٰوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە بـورجی ئەم ئـایەتە پیـرۆزانەی خوارەوە هەڵهاتوون:

﴿مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا﴾ (هود: ٥٦).

﴿وكَأَيِّنْ مِنْ دَابَّةٍ لا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللّٰهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ﴾ (العنكبوت:٦٠).

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الإسراء:٧٠).

﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيْمٍ﴾ (الإنفطار:١٣).

ئیـتر ئەو میهرەبـانییە فـراوان و چاکەکـارییە گشـتییە دنیـای ئـادەمیزاد و زیندەوەرانی پڕکردەوە و، تەنانەت وەك بەهەشـتێکی کـاتی لە بەرچـاودا خـۆی نواند. لەمەوە گەشتیارەکە تێگەیشت کە ئەم دنیایە و هەرچییەکی تێـدایە زۆر بە باشی خاوەن و میوانداری بەڕێزی ئەم میوانخانە جوان و شایستەی بینین و پـڕ لە پەندە، بە بینەرانی دەناسـێنێت. بـۆیە هەزار جـار سـوپاسی خـوای گەورەی دەربڕی و، وتی:

﴿الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ﴾.

◆ **نموونەی سێهەم** لەو گەشتەی کە سەدان بینینی ئەو گەشـتیارەی لە خـۆ گرتووە، ئەوەیە کە:

ئەو گەشتیارەی ناو دنیا کە دەیەوێت لە ڕێی دەرکەوتن و درەوشانەوەی ناوە جوانەکان و سیفەتە مەزنەکانی بەدیهێنەرەوە، بەدیهێنەری بناسـێت، بە ژیـری و ئەندێشەی خۆی وت:

وەرن با وەك گیان و فریشتەكان جەستەمان لە زەویدا بەجێ بهێڵین و بۆ ئاسمانە بڵندەكان سەربكەوین و، لە بارەی بەدیهێنەرمانەوە پرسیار لە سەرنشینانی ئەوێ بكەین.

ئیتر ژیریی ئەو گەشتیارە سواری كەشتیی "بیر" و گیانیشی سواری كەشتیی "ئەندێشە" بوون و، پێكەوە بە ڕابەرایەتیی گەردوونناسی بەرەو ئاسمان سەركەوتن و، بە چاویلكەی ﴿الضَّالِّيْنْ﴾ و ﴿الْمَغْضُوْبِ عَلَيْهِمْ﴾ واتە بە چاویلكەی ئەو فەلسەفەیەی كە بایەخ بە ئایین نادات، سەیری ئەویان كرد. ئەم گەشتیارە بەو چاویلكەیە بینیی كە:

هەزاران تەن و ئەستێرەی ئاگرین كە هەزار جار لە زەوی گەورەترن و سەد جار لە خێرایی گوللەتۆپەكان خێراترن و، بێگیان و هەستن و، وەك وێڵ و بێ خاوەن وان، بەناو یەكدا دێن و دەڕۆن، بە ڕادەیەك كە ئەگەر یەكێكیان بۆ یەك خولەك بە ڕێكەوت ڕێی خۆی ون بكات و بەر یەكێكی تری ئەو ئەستێرە بێ هەستانە بكەوێت، ئەوا بە وێنەی چێشتی مجێور تێكەڵ بە یەك دەبن و، پشێوی هەموو لایەك دەگرێتەوە و، لەو جیهانە بێسنوورەدا شتێكی هاوشێوەی قیامەت ڕوودەدات. ئیتر گەشتیارەكە سەیری هەر لایەكی بكردایە هەستی بە ترس و بیم و سامناكی و سەرسامی دەكرد، بۆیە هەزار جار پەشیمانیی لە بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان دەربڕی، چونكە ژیری و ئەندێشە هێندە سەریان لێ شێوا كە دەیانوت:

نامانەوێت ئەم چەشنە واتا ئازاربەخشانە بزانین كە دەڵێی سزای دۆزەخن، بگرە هەر حەز بە بینینیشیان ناكەین، چونكە ئەركی سەرەكیی ئێمە بینین و پیشاندانی ڕاستییە جوانەكانە.

ئەوان كە لەم كاتەدا ئەمەیان وت، یەكسەر بە درەوشانەوەیەك لە ا ارە ,
﴿اللّٰهُ نُوْرُ السَّمٰوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ و بە وێنەی خۆری درەخ ا ا ام ، ا ،

جوانـانەی خـوای گەورە: "خـالِق السَّـمٰوات والأرض" و "مُسَـخِّرُ الشـمس والقمر" و "ربُّ العالمين" لە بورجی ئەم ئایەتە پیرۆزانەوە هەڵهاتن:

﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيْحَ﴾ (الملك:٥).

﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوْا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهَمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا﴾ (ق:٦).

﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمٰوَاتٍ﴾ (البقرة:٢٩).

ئیتر ئەو ناوانە سەرجەمی ئاسمانەکانیان بە ڕووناکی و فریشتەکان ڕۆشن کردەوە و، لە بەرچاودا گۆڕینی بە مزگەوتێکی گەورە و سەربازگەیەکی بەشکۆ. بۆیە ئەو گەشتیارە ڕۆشتە ناو ڕیزی دەستەی ﴿الَّذِيْنَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ و، لە تاریکایی ﴿كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ﴾ ڕزگاری بوو.. یەکسەر وڵاتێکی جوان و ڕێکوپێك و بە سام و شکۆی چەشنی بەهەشتی بە چاوی خۆی بینی. بەمەش نرخ و بەهای هەریەك لە "ژیری" و "ئەندێشە" پـلەی بلـند و باڵایـان بەدەست هێنا و هەزار هێندەی خۆیان ئەرکەکانی سەرشانیان بەرز بوونەوە، لەبەر ئەوەی کە لە هەمـوو لایەکی ئاسـمانەکاندا ناسـێنەرێکیان دەبینـی کە بەدیهێـنەری شکۆمەندیان پێ دەناساندن.

بەم جۆرە، کۆتایی بەم باسە فراوانە دەهێنـین و، لێـرەدا ئەم ئامـاژە یەکجـار پوخت و کورتەمان پێ سەروزیادە و، بـاسی بینینەکـانی تـری گەشـتیارەکە لەم گەردوونەدا بە پەیامەکانی نوور دەسپێرین و، بە پێـوەری ئەم سـێ نمـوونەیەی نێوان سەدانی ئەو نموونانەدا لێیان تێدەگەین کە ئەو گەشتیارە بۆ ناسینی خوای گەورەی "واجب الوجود" لە ناوەندی درەوشـانەوەی نـاوە جوانەکـانی خـوای گەورەدا بینیونی.

ئـێمەش وا هەوڵ دەدەیـن کە بە ئامـاژەیەکی زۆر پوخـت بەدیهێـنەری ئەم گەردوونە بناسـین، بە وێـنەی ئەو ناسـینەی کە گەشـتیارەکە بەدەسـتی هێنـا. ئەمەش لە ناوەنـدی ئاسـەوارەکان و درەوشـانەوەکانی هەر سـێ سـیفەتی:

"زانست" و "ویست" و "توانست"ەوە لە نێوان حەوت سیفەتە مەزنەکانی بەدیهێنەرمان و، لە بەڵگەکانی هاتنەدیی ئەو سێ سیفەتە مەزنەوە. درێژەپێدانەکانیشی بە "پەیامەکانی نوور" دەسپێرین.

ئەم بڕگە عەرەبییەی خوارەوە ویردی بەردەوامی منە و، لە پوختەی "الحزب العربي النوري"یەوە هەڵێنجراوە و، سێ دانە لە سی و سێ پلەکەی "اللّٰهُ أكبر" ڕوون دەکاتەوە لە نێوان لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ئەم سێ پلەیەشدا و بە شێوەیەك کە لە تەرجەمەیان بچێت ئاماژە بۆ ئەو شتانە دەکەین کە زۆر کەسی لە زانایانی عەقیدە و زانستی کەلام بە خۆیانەوە سەرقاڵ کرد، لەبارەی زانینی ئەو سیفەتانە لە ڕێی درەوشانەوەیان لە گەردووندا و باوەڕ پێکردنیان بە ئیمانێکی توندوتۆڵی دامەزراو. جا ئەم بڕگە عەرەبییە بە "علم اليقين" تا پلەی بەڵگەنەویستی ڕێیەك بەرەو ئیمان بەو سێ سیفەتە دەکاتەوە، لەو ڕووەوە کە بەڵگەن لەسەر "بوون" و "تاك" و "تەنیایی" خوای گەورەی "واجب الوجود".

(بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَداً وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيراً﴾ (الإسراء:١١١).

اللّٰهُ أَكْبَرُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ قُدْرَةً وَعِلْماً إِذْ هُوَ الْعَلِيْمُ بِكُلِّ شَيْءٍ بِعِلْمٍ مُحِيْطٍ لازمٍ ذَاتِيٍّ[1] لِلذَّاتِ يَلْزَمُ الْأَشْيَاءَ لا يُمْكِنُ أَنْ يَنْفَكَّ عَنْهُ شَيْءٌ بِسِرِّ الْحُضُوْرِ وَالشُّهُوْدِ وَالْإِحَاطَةِ النُّوْرَانِيَّةِ وَبِسِرِّ اسْتِلْزَامِ الوُجُودِ لِلْمَعْلُوْمِيَّةِ[2] وَإِحَاطَةِ نُورِ الْعِلْمِ بِعَالَمِ الْوُجُوْدِ.

نَعَمْ فَالانْتِظَامَاتُ الْمَوْزُوْنَةُ.. وَالاتِّزَانَاتُ الْمَنْظُومَةُ.. وَالْحِكَمُ الْقَصْدِيَّةُ الْعَامَّةُ.. وَالْعِنَايَاتُ الْمَخْصُوصَةُ الشَّامِلَةُ.. وَالأَقْضِيَةُ الْمُنْتَظَمَةُ.. وَالأَقْدَارُ الْمُثْمِرَةُ.. وَالآجَالُ الْمُعَيَّنَةُ وَالأَرْزَاقُ الْمَقَنَّنَةُ.. وَالاتْقَانَاتُ الْمُفَنَّنَةُ..

---

(١) وللهِ الْمَثَلُ الأعلى ، وەك پێویستیی خۆر بە ڕووناکیی دەوروبەر. (دانەر)

(٢) لە هەندێ نوسخەدا لە بریی ئەم وشەیە نووسراوە: "لِلْعُمُوْمِيَّةِ". (وەرگێڕ)

وَالْاهْتِمَامَاتُ الْمُزَيَّنَةُ.. وَغَايَةُ كَمَالِ الْانْتِظَامِ وَالْانْسِجَامِ وَالْاتِّسَاقِ وَالْإتْقَانِ وَالْاتِّزَانِ وَالْامْتِيَازِ الْمُطْلَقَاتِ فِي كَمَالِ السُّهُولَةِ الْمُطْلَقَةِ.. دَالَّاتٌ عَلَى إحَاطَةِ عِلْمِ عَلَّامِ الْغُيُوبِ بِكُلِّ شَيْءٍ: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك: ١٤). فَنِسْبَةُ دَلَالَةِ حُسْنِ صَنْعَةِ الْإِنْسَانِ عَلَى شُعُورِ الْإِنْسَانِ إلَى نِسْبَةِ دَلَالَةِ حُسْنِ خِلْقَةِ الْإِنْسَانِ عَلَى عِلْمِ خَالِقِ الْإِنْسَانِ كَنِسْبَةِ لُمَيْعَةِ زُجَيْجَةِ[١] الذُّبَيْبَةِ فِي اللَّيْلَةِ الدَّهْمَاءِ إلَى شَعْشَعَةِ الشَّمْسِ فِي رَابِعَةِ النَّهَارِ).

لە ناوەندی جۆرە وەرگێڕانێکی یەکجار کورتی ئەم بڕگەیەدا، چەند پوختە ئاماژەیەك بۆ "زانستی خوایی" دەکەین، کە ڕاستییەکی ئیمانیی گرنگە و، درێژەپێدانەکانیان بە "پەیامەکانی نوور" دەسپێرین و، دەڵێین[٢]:

بەڵێ، هەروەك "میهرەبانی" لە ڕێی ڕزق و ڕۆزییەکانیەوە بە وێنەی خۆری درەخشان خۆی دەردەخات و، بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ ئەوە دەچەسپێنێت کە لە پشت پەردەی غەیبەوە بەخشندەیەکی میهرەبان هەیە، "زانست"یش کە لە نێوان سەدان ئایەتی قورئاندا جێی خۆی گرتووە و، لە ڕوویەکەوە یەکەمی حەوت سیفەتە مەزنەکانی خوای گەورەیە، بە هەمان جۆر و بە وێنەی خۆری درەخشان و بەهۆی بەروبووم و دانستی ڕێکوپێکیەوە خۆی دەردەخات و، دەبێت بە بەڵگەیەکی ڕەها لەسەر زانایەك کە لە هەموو شتێك ئاگادارە.

بەڵێ، ڕێژەی بەڵگەی سنعەت و کاری ڕێکوپێك کە مرۆڤ ئەنجامی دابێت، لەسەر هەست و نەست و زانستی ئەو.. لەچاو ڕێژەی بەڵگەی بەدیهێنانی مرۆڤ لە جوانترین شێوەدا، لەسەر زانست و دانستی بەدیهێنەری

(١) لە هەندێ نوسخەدا لە بریی ئەم وشەیە نووسراوە: "نُجَيْمَة". (وەرگێڕ)

(٢) بەشی دووهەم لە کاتی گیرۆدەبوونم بە نەخۆشییەکی هێندە سامناك و ژەهراویدا نووسراوە کە لە ژیانمدا نەخۆشیی وام نەدیوە. تکام وایە بە چاوی لێبووردن بڕواننە کەموکوڕییەکانم و، "خەسرەو" دەتوانێت هەر دەستکارییەکی پێ باشە بیگۆڕێت و ڕێکوپێکی بکات. (دانەر)

مرۆڤ، وەك ڕێژەی جیاوازیی نێوان بریسکانەوەی مێرووی گوڵەئەستێرە وایە لە شەوی تاریکدا، لە چاو درەخشانیی خۆر لە ناوەڕاستی ڕۆژ لە ناوجەرگەی ئاسماندا!

ئێستا پێش ئەوەی درێژە بە ڕوونکردنەوەی بەڵگەکانی"زانست"ی خوای گەورە بدەین، دەبێ باسی ئەوە بکەین کە بەڵگەی درەوشانەوە و دەرکەوتنی ئەو سیفەتە خاوێنە لە هەموو جۆرەکانی بوونەوەراندا، هێندە ڕوونە کە ئەو گفتوگۆیە شایەتیی لەسەر دەدات لە شەوی میعراجدا و لە دەمی بەهرەمەندبوونی پێغەمبەر ﷺ بە ئامادەبوونی حوزوور و بیستنی گوفتاری خوای گەورەدا ڕووی دا. ئەوەبوو بەناوی هەموو زیندەوەران و سەرجەمی جۆرەکانی بوونەوەرانەوە و، لەو ڕووەوە کە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوە، لە حوزووری خوای گەورەدا فەرمووی:

"التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلّٰه"..

بەمەش دیاریی هەموو زیندەوەرانی لە تەرز و شێوەی پەروەردگارناسیی هەریەك لەو بوونەوەرانەدا و لە ڕێی درەوشانەوەی"زانست"ەوە پێشکەش بە بەدیهێنەری شکۆمەند کرد و، بە ناوی هەموو خاوەن هەستەکان و، لە بریی سڵاو ئەو تەحیاتەی لە حوزووری خوادا فەرموو.

واتە: هەر چوار دەستە و کۆمەڵەکانی سەرجەمی زیندەوەران، بەم چوار وشەیە: (التَّحِيَّات، الْمُبَارَكات، الصَّلَوَات، الطَّيِّبَات) و، بە لێی درەوشانەوەی"زانستی ئەزەلی و ئەبەدی"سڵاویان و پیرۆزبایی و بەندایەتی و ناسینی جوان و خاوێنی خۆیان بەرامبەر خوای گەورە و زانای پەنهانەکان پێشکەش دەکەن. هەر لەبەر ئەوەیە کە خوێندنی ئەم گفتوگۆ خاوێنە - بە واتا فراوانەکەی - لەسەر هەموو موسڵمانێك لە تەحیاتی نوێژدا فەرز کراوە.

وا لە خوارەوەدا و لە نێوان چوار ئامـاژەی پوختـدا یەکێـك لە واتاکـانی ئەو گفتوگۆیە ڕوون دەکەینەوە و، درێژەپێدانی ئەم باسـەش بە "پەیامەکـانی نـوور" دەسپێرین.

❐ **وشەی یەکەم: "التَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ".**

واتاکەی بە پوختی ئەوەیە کە:

ئەگەر وەستایەکی کارامە، بە زانسـتی فـراوان و زیرەکیـی نـاوازەی خـۆی، مەکیـــنەیەکی نائاســـایی دروســـت بکـــات، ئەوا هەر کەســـێك مەکیـــنە سەرســـوورهێنەرەکە ببینێـــت، بە سەرســـووڕمان و ڕێزلێنـــانەوە، پیرۆزبـــایی لە وەستاکە دەکـات و، دیـاری و سـڵاوی مەعنەویـی هـاودەم لەگەڵ سـوپاس و پێزانیندا پێشکەش دەکات.

جا هەروەك ئەو مەکینەیە لەم نموونەیەدا وایە، هەموو دەسـتە و جۆرەکـانی بـوونەوەرانیش لەم بـوونەوەرەدا، بگـرە یەك بە یەکی ئەو دەسـتە و کـۆمەڵانە، تەنانەت دانە دانەشیان، لە ڕاستیدا لە هەمـوو ڕوویەکەوە، سـەرتاپا ئیعجـازە و، پیرۆزبایی لەو بەدیهێنەرە مەزنەی خۆی دەکات کە لە ڕێـی درەوشـانەوەکانیەوە "زانستە فراوانەکەی خۆی" دەناسێنێت، کە زانستێکە پەیوەندیی هەمـوو شـتێك بە هەر شتێکی ترەوە دەبینێت و، پێداویستییەکانی ئەو شتە لە دەمـی پێویسـتییدا بەو شتە دەگەیەنێت..

بەڵێ، هەموو یەکێکی ئەو زیندەوەرانە پیرۆزبایی لە بەدیهێنەریـان دەکەن و، بە زمانی حاڵی ژیانیـان دەڵـێن: "التَّحِيَّـاتُ لِلّٰـهِ". هەروەك بە زمـانی گوفتـاری خاوەن هەستانی چەشنی مرۆڤ و جیننی و مەلائیکەتـیش پیرۆزبـایی ئاراسـتە دەکەن. ئیتر هەموو زیندەوەران نرخـی ئەو ژیـانەی بەدیهێـنەر پێـی بەخشـیون ڕاستەوخۆ لە واتای پەرستشدا پێشکەش بەو بەدیهێنەرەیان دەکەن کە ئاگـای لە حاڵی هەموو بەدیهاتووانیەتی.

پێغەمبەریش ﷺ لە شەوی میعراج لە حوزووری خـوای گەورەی "واجـب الوجود"دا لە بریی سڵاو، بە ناوی هەموو زیندەوەرانەوە گوزارشتی لەم ڕاستییە کرد و فەرمووی: "التَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ". بەمەش دیاری و سڵاوی مەعنەویی دەسـتە و کۆمەڵ و تاك و دانە دانەکانی زیندەوەرانی پێشکەشی خوای گەورە فەرموو.

بەڵێ، ئەگەر مەکینەیەکی ڕێکوپێکی ئاسایی بە پێکهاتەی ورد و ڕێکـوپێکی خۆی ببێت بە بەڵگەیەك لەسەر سنعەتکارێکی کارامە و لێزان، ئەوا هەریەك لەو مەکیـنە زینـدووە لەژمـارەبەدەرانەی کە گەردوونیـان پـڕ کـردووە، هەزار و یەك موعجیزەی زانستی پێش چـاو دەخەن و، بـێ هـیچ گومانێـك زینـدەوەران بە لێدرەوشانەوەی "زانست" دەبن بە بەڵگە لەسەر پێویسـتیی بـوونی بەدیهێـنەری هەمیشـەیی و پەرسـتراوی ڕاسـتەقینەی خۆیـان. کە ئەم بەڵـگەیەش وەکـو ڕووناکیی خۆر وایە، لە چاو ئەوەی مەکینەکە بوو بە بەڵگە لەسـەر وەسـتاکەی خۆی، کە وەك ڕووناکیی گوڵەئەستێرە وایە.

**❐ وشەی بەرز و بڵندی دووهەم لە وشەکانی میعراج: "الْمُبَارَكاتُ".**

مادەم "نوێژ" میعراجی ئیمانداره - وەك لە فەرموودەی پیرۆزدا چەسـپاوە - و نوورەکانی میعراجی مەزنی تێدایە..

مادەم لە لایەکی تریشەوە گەشتیارەکەی نـاو دنیـا بە سـیفەتی "زانسـت" لە هەموو جیهاندا بەدیهێنەری خۆی ناسی، کە زانای غەیب و پەنهانەکانە..

ئەوا ئێمەش لەگەڵ ئەو گەشتیارەدا دەڕۆیـنە نـاو جیهـانی فـراوانی شـتانی پیرۆز(الْمُبَارَكاتُ)ەوە کە زمانی غەیری خۆیـان بە پیرۆزبـایی دەخەنە گوفتـار. هەوڵیش دەدەین - بە وێنەی ئەو گەشتیارە - بە زانینـێکی یەقینـی و لە ناوەنـدی درەوشـانەوە ورد و سەرانســەر موعجیزەکـانی سـیفەتی "زانسـت"ی خـوای گەورەوە بەدیهێنەرمـان بناسـین لە دەمـی موتـاڵاکردنی ئەو جیهـانە پیـرۆزەی "الْمُبَارَكاتُ"دا، بە تایبەت جیهانی گیانلەبەرە بچووك و ناسك و بەرپیە[illegible]

جیهـانی ناوك و تۆوەكان كـــە چەنـد وردە قوتـوویەكی بچووكــن بەرنـــامە و پێڕست و شتانی تەقدیركراوی ژیانی زیندەوەرانیان لەخۆ گرتووە.

بەڵـێ، ئـێمە بە چـاوی خۆمـان دەبینـین كە هەمـوو ئەو زینـدەوەرە ورد و بچووك و ناسك و بەریپانە و، سەرجەمی ئەو گەنجینە ورد و قوتووە پیـرۆزانە، هەموویان پێكەوە و، دانە دانەشیان بە جیا جیا، بە زانستی كەسێكی زانـا و دانـا ڕادەپەڕن و بەرەو ئەو ئامانجانەیان دەڕۆن كە لەپێناویاندا بەدیهێنراون. تەنانەت ڕۆیشــتن و جموجووڵیــان بەرەو گەیشــتن بەو ئامانجـانە، بە شـێوەیەكە هەر كەسێك بە چاوی حەقیقەتبین سەیریان بكات هێندە سەری سـووڕدەمێنێت كە دەڵێت:

"هەزار هەزار جار: بارَكَ اللّٰه.. ما شَاءَ اللّٰه".

بەڵێ، هەر یەك لە نوتفە و هێلكە و گەرا و ناوك و تۆوەكان - بۆ نموونە - لە ناوەندی ڕێسایەكی یەكجار ورددان كە لە "زانست"ەوە سەرچاوەی گرتووە..

ئەو ڕێسایەش لە ناوەندی تەرازوویەكی هێندە ورددایە كە هی كـارامەییەكی تەواوە و.. ئەو تەرازووەش لە ناوەندی ڕێكخستنێكی نوێدایە..

ئەویش لە نێوان پێوانە و كێشانەیەكی ناوازەدا..

ئەویش لە ناوەندی پەروەردەكردن و، جیـاكردنەوە و، چـــەندین نیشـــانەی جـوداكەرەوەی مەبەسـتداری وەك ئەمانەدایە..

ئەویش لە نێوان ڕازاندنەوە و ئارایشتكارییەكی ڕێكوپێكدایە..

ئەویش لە ناو چەندین ئامێری ورد و دانا و گونجاوی وێنەگرتندایە..

ئەویش لە نێوان جیاوازیی گۆشت و بەروبووم و بەشـەكانی ئەو شـتانەدایە كە دەخـورێن لەو بـوونەوەرانەدا، بە مەبەسـتی تێركـردنی هەمـوو ئەوانەی كە پێویستیان بە ڕۆزییە و، بە شێوەیەكی كەریمانەی ئەوتۆ كە لەگەڵ چێژی یەك بە یەكیاندا بگونجێت..

ئەمەش لە ناوەندی چەندین نەخشونیگار و شکڵ و شێوەی جیاجیای ئارایشتدایە کە بە زانست و ئیعجاز ڕازاوەتەوە و..

ئەمەش لەناو چەند بۆن و بەرامەیەکی خۆش و جۆراوجۆر و تام و لەزەتی جیاجیادایە کە:

دەرکەوتنی وێنە و شێوەکانی ئەو زیندەوەرانە و جیابوونەوەیان لە یەکتری بە کەماڵی ڕێکوپێکی و بێ هیچ هەڵە و سەهوکردنێك و لەوپەڕی خێرایی ڕەها و فراوانیی ڕەهادا، لە کاتێکدا کە لەوپەڕی زۆریی ڕەهادان و، بەردەوام بوونی ئەم حاڵەتە دەراسایە لە هەموو وەرزێکدا، وا لە هەموو دانەیەکیان و هەمووشیان پێکەوە دەکات کە بەم پازدە زمانەی باس کران "زانستی خوایی" دەربخەن و، سەرنجەکان بۆ لای کارامەیی دەراسای پەروەردگاریان ڕابکێشن و، بیکەن بە بەڵگە لەسەر زانستە ئیعجازبەخشەکەی. ئیتر لەم ڕێیەوە و بە چەشنی خۆری درەخشانی ئاسمان بەدیهێنەری خۆیان، کە خوای "واجب الوجود" و زانای پەنهانەکانە، بە بینەرانیان دەناسێنن.

جا ئەم شایەتییە فراوان و یەکجار درەخشانەی ئەوان و ئەم پیرۆزباییە جوانەیان بوو بۆ بەدیهێنەریان کە پێغەمبەرﷺ لە شەوی میعراجدا دەریبڕی و بە ناوی هەموو بوونەوەرانەوە پێشکەشی کرد و لە بریی سڵاو فەرمووی: "الْمُبَارَكاتُ"!

□ وشەی سێهەم: "الصَّلَوَاتُ".

سەد ملیۆن ئیماندار هەمان وشەی پیرۆز ڕادەگەیەنن و دەیڵێنەوە کە لە میعراجی مەزنی پێغەمبەردا ﷺ وتراوە و، لە میعراجی تایبەتی هەموو ئیمانداریێك (واتە لە تەحیاتی نوێژ)یشدا بە لای کەمەوە ڕۆژی دە ج... ار دەوترێتەوە و، لەمەدا شوێنی پێغەمبەرﷺ دەکەون و لە سەرانسەری گەردوو... ڕایدەگەیەنن و پێشکەشی حوزووری پەروەردگاری دەکەن.

لەبەر ئەوەی سەرجەمی ڕاستییەکانی میعراج بە شێوەیەکی تـابڵێی بەهێـز و گومانبڕ لە پەیامی میعراج (وتەی سی و یەکەم)دا چەسپاوە و ڕوون کراوەتەوە، تەنانەت لە دەمی ئاراستەکردنی گوفتاردا بۆ بابای مولحیـدی سەرسـەختیش.. ئەوا درێژەدان بە بەڵگەکانی ئەم باسە بەو پەیامە ناوبراوە دەسپێرین..

بەڵام لێرەدا ئاماژەیەکی لەوپەڕی کورتیدا بۆ واتای فراوانی ئەم سێهەم وشـە میعراجییە دەکەین کە جیهانە سـەرسـووڕهێنەرەکانی هەموو دەسـتە و تاقمێکی زیندەوەران و خاوەن هەسـت و نەسـتەکان ڕوونی دەکەنەوە. ئیـتر بـۆ خۆمـان سەیری ئەو جیهانانە دەکەیـن و، هەوڵ دەدەیـن لە ناوەنـدی زانسـتی ئەزەلیـی خواوەندەوە بوون و، یەکتـایی و، کەمـاڵی بەخشـندەیی میهرەبـانی و، مەزنیـی توانست و، هەمەلایەنگریی ویستی بەدیهێنەرمان بزانین و پێی ئاشنا ببین.

بەڵێ، لەم جیهـانەدا بە چـاوی خۆمـان دەبینـین کە هەمـوو گیانـدارێك بە هەستی فیـترەتی خـۆی - بـا بە هەسـتی ژێـریش نەبـێ - هەسـت دەکـات کە گیرۆدەی دەستەوسانی و لاوازییەکی بێ سنوورە ، لەکاتێـدا کە دوژمنەکـانی و ئەو شـــتانەش مـــایەی ئەوەن ئـــازاری دەرخـــوارد بـــدەن هێنـــدە زۆرن کە لەژمارەنایەن..

هەروەها هەریەکەیان هەست دەکەن کە لە نـاو هەژاری و دەسـتکورتییەکی بێسنووردا دەتلێنەوە، لە کاتێکدا کە داواکاری و پێداویستییەکانی کۆتایـان پـێ نایەت.

جا لەبەر ئەوەی توانا و دەستمایەکەی دەستی هێشـتا بەشی یەك لە هەزاری ئەو پێداویسـتی و داواکارییانەی نـاکەن، ئەوا هەتـا لە توانایـدایە داد و هــاوار دەکات و، دەگری و، لە ناوەرۆك و سروشتیدا دەلاڵێتەوە.

خۆ کـاتێ کە بە دەنـگ و زمـانی تـایبەتیی خـۆی و بە دوعـا و پـاڕانەوە و لالانەوەی تایبەت بە خۆی و بە جـۆرە نـوێژێکی تـایبەت هانـا بـۆ دەرگـانەی

خوای گەورەی زانای بەتوانا دەبات، یەکسەر دەبینین کە خوایەکی بە توانای دانای خاوەن زانستی ڕەها ئاگای لە سەرجەم پێداویستییەکانی هەموو ئەو زیندەوەرانەیە و بۆیان جێبەجێ دەکات و، یەك بە یەکی دەرد و بیمارییەکانیان دەبینێت و فریایان دەکەوێت و، هەموو ئەو دوعا و پاڕانەوانەش دەبیستێ کە بە سروشت دەیکەن و لێیان گیرا دەکات..

ئیتر ئەو خواوەندە میهرەبانە گریانەکانی ئەوان دەگۆڕێت بە چەندین خەندەی شیرین و، داد و هاواریشیان دەگۆڕێت بە حەمد و شوکر و سوپاس.

ئەم فریا گوزارییەی کە شەقڵ و نیشانەی زانست و میهرەبانیی پێوە دیارە، لە ڕێی دەرکەوتن و درەوشانەوەی زانست و میهرەبانییەوە، بەڵگەیە لەسەر: خوای گەورەی فریادڕەسی فریاگوزاری میهرەبانی بەخشندە.

جا ئەو هەموو سڵاوات و دوعایانەی کە لەم جیهانانەی زیندەوەرانەوە بەرەو ئەو خواوەندە فریادڕەسە بەرز دەبنەوە، پێغەمبەرﷺ لە میعراجی گەورەدا - بەم واتایە - تایبەت و پێشکەشی حوزووری خوای گەورەی کرد و، هەموو ئیماندارێکیش لە میعراجی بچووکی هەموو نوێژێکدا بە "الصَّلَوَاتُ الطَّـيِّبَاتُ" لە پشتسەری پێغەمبەرەوەﷺ دەیڵێتەوە و دووپاتی دەکاتەوە.

❑ **وشەی بڵندی چوارەم: "الطَّـيِّبَاتُ لِلّٰهِ".**

لەبەر ئەوەی لە دەمی زیکرەکانی نوێژدا زۆر لە ڕاستییەکانی پەیامەکانی نوور بە دڵمدا دێن، ئەوا لە سەر بناغەی ئەم حیکمەتە و بێ ئەوەی لە ویست و ئیختیاری خۆمدا بێت وام هەست کرد کە بڵێی بەرەو ڕوونکردنەوەی حەقیقەتی وشەکانی سوورەتی فاتیحە و تەحیات - بە چەند ئاماژەیەکی پوخت - دەدرێمە بەر.

بەم جۆرە، وشەی خاوێنی "الطَّيِّبَات"یش کە لە میعراجی گەورەی محەممەدیداﷺ وتراوە، واتای ئەو شتە پاکانەی لەخۆ گرتووە کە لە ژمارە

نایەن و لە زاری مرۆڤ و جیننی و مەلائیکەت و ڕۆحانییەکانەوە دەردەچن، کە ئەهـلی ناسـین و ئـیمان و هەسـت و نەسـتی هەمەکـین و، سەرانسـەری گەردوونیـان بە وشـەی خـاوێن و کـردەوەی چـاك و بەنـدایەتیی پاکیـان ڕازاندووەتەوە و ئاراستەی جیهانە جوانەکانیان کردووە و، بە تەواوی هەست بە جوانییە بێسنوورەکانی خـوای گەورەی خـاوەن جـوانیی ڕەهـا و سـەرمەدی و جوانیی بەردەوامی ناوە جوانەکانی دەکەن کە گەردوونیان ڕازاندووەتەوە.

ئیتر لە بەرامبەر ئەو جـوانییە سـەرمەدییەی خـوای گەورە و جـوانیی نـاوە جوانەکـانیەوە بە پەرستشـی هەمەکی و پـڕ لە شـەوق و ئەویـن و، بە بـۆن و بەرامەی خۆشی ئیمانی درەخشان و، ناسینی فراوان، حەمد و سەنا پێشـکەشی بەدیهێنەری میهرەبانی خۆیان دەکەن و ئەرکی بەندایەتی بەجێ دەهێنن..

ئیتر بە حوکمی ئەم واتا فراوانەی ئەو شتە پاکانە(الطَّـيِّـبَات)ی کە لەسنوور بەدەرن و، بەپێی ناوەرۆکی ئەوەش کە لە میعراجدا وتراوە، سەرجەمی نەتەوەی ئیسلام هەموو ڕۆژێك و بە بێ بێزار بوون، هەمان وشـەی خـاوێن لە تەحیاتـدا دەڵێنەوە.

بەڵـێ، گەردوون ئـاوێنەیەکە جـوانیی سـەرمەدی و بێسـنوور دەردەخـات. هەرچی جوانی و قەشـەنگی لە بوونەوەرانـدا هەیە لەو جـوانییە سـەرمەدییەوە سەرچاوەی گرتووە و، بەهۆی نیسـبەت و پەیوەندیشـی لەگەڵ ئەو جـوانییەدا دەڕازێتەوە و بەرزی و بڵندی بەدەست دەهێنێت. چونکە ئەگەر ئەو نیسـبەت و پەیوەنـدییە نەبـوایە سەرانسـەری گەردوون دەبـووە وێـرانە و ماتەمینگـایەکی سامناك.

بوونی ئەو نیسبەت و پەیوەندییەش بەوەدا دەزانرێت کە مـرۆڤ و جینـی و مەلائـیکەت و ڕۆحانییەکـان خـوای خۆیـان دەناسـن و تەسـدیقی دەکەن. لە کاتێکدا کە ئەوان دەلاڵ و بانگەوازکاری بوونەوەرانن بـۆ لای دەسـتەڵاتداریی خوایەتیی خوای گەورە. تەنـانەت ئەو حەمـد و سـەنا جـوانەی کە پێشـکەشی

خوای گەورەی دەکەن و بە هەموو شوێنێکی گەردوون و تەنانەت بە عەرشی مەزنیشی دەگەیەنن، سەرجەم گەردیلەکانی هەوا لە بەرامبەر ئەمەوە بەوپەڕی ئامادەباشی ڕادەوەستن و بۆ بڵاوکردنەوەیان لەو شوێنانەدا ڕادەپەڕن. وەك بڵێی گەردیلەکانی هەوا چەند وردیلە زمان و گوێیەکی بچووك بن بۆ بەرزکردنەوە و پێشکەشکردنی ئەو وشە خاوێنانە (الطَّيِّبَات) لە حوزووری خوای گەورەدا. بۆیە گریمانێکی یەکجار بەهێزم بە دڵدا هات کە ئەو ئەرکە دەراسا و سەرسووڕهێنەرە بە "هەوا"سپێررابێت.

جا هەروەك مرۆڤ و جینننی و مەلائیکەت لە ڕێی ئیمان و پەرستشەکانیانەوە پەرستراوی شکۆمەندیان بە غەیری خۆیان دەناسێنن، ئەو دانا شکۆمەندەش هەر بۆ خۆی و لە ڕێی ئەو توانا گشتی و زۆرانەی کە لەو بانگەوازکارانەدا داینـاوە و بەهۆی ئەو کۆئەندامە ناوازە و دەراسایانەی پێی بەخشیون و بەو وردەکارییە زانستییەی لەواندایە، بە چەشنێکی ئاشکرا و ڕووناك و درەخشان خۆی دەناسێنێت و، هەریەك لەو بانگەوازکارانەی بە سەرانسەری گەردوونەوە پەیوەست کردووە، وەك بڵێی هەریەکەیان گەردوونێکی بچووککراوە بن.

بۆ نموونە: بەدیهێنانی هێزی پارێزکار و ئەندێشە و بیرکردنەوە و مەکینە سەرسووڕهێنە هاوچەشنەکانی تری ئەوان لە شوێنێکی بچووکی مێشکی مرۆڤدا کە هێندەی بارستایی یەك دانە گوێز تێپەڕ ناکات و.. دروستکردنی هێزی پارێزکاری مرۆڤ لە شێوەی کتێبخانەیەکی گەورەدا، دەریدەخات کە خوای گەورە، بە دەرکەوتن و درەوشانەوەی زانستی ئەزەلی و بە وێنەی خۆری درەخشانی ناوجەرگەی ئاسمان، خۆی دەردەخات و ئاشکرای دەکات[1].

---

(١) نەخۆشییە سەختەکەم بواری ڕوونکردنەوەم نادات. ئەوەی کە نووسیومە تەنها سەرچاوە و یارمەتیدەری ئەرکی سەرشانی"خەسرەو"ە لە تەرجەمەدا. (دانەر)

ئێستاش بە چەند ئاماژەیەکی تابلێی کورت ئامـاژە بـۆ نـاوەرۆکی ئەو بـڕگە عەرەبییـە دەکەیـن کە لە پێشـەکیی ئەم باسـەدا هێـنرا و، ئامـاژە بـۆ بەڵـگە هەمەکییەکانی زانستی گشتگیری خواوەند دەکات و، بەڵـگەیەکی هێنـدە مەزنە کە گەلێ بەڵگەی بێسنووری لە خۆگرتووە و، بە پازدە بەڵـگە "زانسـتی ئەزەلی" ڕوون دەکاتەوە.

● **بەڵگەی یەکەم** لەو پازدە بەڵگەیە بزیتییە لە:

(فَالانْتِظَامَاتُ الْمَوْزُوْنَةُ).

واتە: ئەو ڕێکــوپێکییەی کە ئەنــدازەکەی دیــاری کــراوە و، لە هەمـــوو بەدیهاتوواندا بە چاو دەبینرێـت و، بەپێـی تەرازووی سـەرنەکەری ورد ئەنجـام دراوە، بەڵگەیە لەسەر زانستێکی دەورەدەر بە هەموو شتێك.

بەڵێ، هەر لە سەرجەمی گەردوونەوە، کە وەك کۆشکێکی نـاوازەی وەهـایە هەمـوو لایەکی بە ڕێکـوپێکی ڕێکخرابێـت و.. لە کـۆمەڵی خـۆرەوە و.. لە تـوخمی هەواوە، کە گەردیلەکـانی بە شـێوەیەکی سەرسـووڕهێنەر دەنـگ و وشەکان بڵاو دەکەنەوە و ڕێکوپێکییەکی ناوازە دەردەخات.. لە ڕووی زەوییەوە کە لە هەموو بەهارێکدا بە تەرازووی ڕێسـا و ڕێکـوپێکی سێسـەد هەزار جـۆر زینـدەوەرە جۆراوجۆرەکـان ئامـادە دەکـات.. هەتـا دەگـاتە یەك بە یەکی کۆئەندامەکانی هەموو زیندەوەرێك، بگرە تا دەگاتە هەموو ئەندامێکی و گشت خانەیەکی، تەنانەت تا دەگاتە هەموو گەردیلەیەك لە گەردیلەکـانی جەسـتەی.. هەموو یەکێکی ئەوانە، ئاسەواری زانسـتێکی ناسـك و نیـانە کە دەورانـدەوری هەموو شتێکی داوە و هیچ شتێك ون ناکات و لەبیری ناچێت.

بەڵێ، بـوونی ئەم ڕێسـایە کە هەمـوو شـتێك بە تـەرازووی ورد ئەنجـام دەدات و.. ئەم ڕێکـوپێکییە هەرە تەواوە لە هەمـوو ئەو شـتانەدا کە باسـکران، بەڵگەیەکی گومانبڕە و بە ئاشکرا دەریدەخات و شایەتی لەسەر ئەوە دەدات کە "زانستێکی گشتگیر" هەیە دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە.

● **بەڵگەی دووهەم** کە بریتییە لە:

(وَالْاتِّزَانَاتُ الْمَنْظُومَةُ).

واتە: بوونی تەرازوویەك لەوپەڕی ڕێکوپێکیدا و پێوانەیەکی سەرنەکەری لەوپەڕی وردی و تەواویدا لە هەموو بەدیهاتوویەکی هەندەکی و هەمەکیی ئەم گەردوونەدا، هەر لە هەسارە گەڕۆکەکانی ناو بۆشایی ئاسمانەوە، تا دەگاتە خڕۆکە سوور و سپییە مەلەوانەکانی ناو خوێن. کە ئەمەش بە بێگومانی و ڕوونی بەڵگەیە لەسەر زانستێکی گشتگیر و دەورەدەر بە هەموو شتێك و، بە چەشنێکی گومانبڕ دەبێت بە بەڵگە لەسەری.

بەڵێ، ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین کە ئەندام و کۆئەندامەکانی مرۆڤ یان مێش، تەنانەت خانەکانی جەستەی و خڕۆکە سوور و سپییەکانی خوێنەکەشی، لە ڕێ و شوێنی لەبار و گونجاوی خۆیدا بە تەرازوویەکی یەکجار هەستیار و پێوانەیەکی تابڵێی ورد دانراوە کە لەگەڵ یەکتردا و لەگەڵ سەرجەم ئەندامەکانی تری لەشدا بگونجێت. بە ڕادەیەك کە دەبێت بە بەڵگەیەکی بێگومان لەسەر ئەوەی کەسێك زانستێکی گشتگیر و هەمەلایەنگری نەبێت هەرگیز ناتوانێت ئەو بارودۆخ و ڕێ و شوێنانە بە هیچ کام لەو شتانە ببەخشێت و هەرگیز ناگونجێ کاری وا ئەنجام بدات.

بەم جۆرە، هەموو زیندەوەرێك و سەرجەم جۆرەکانی بەدیهاتووان، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە هەسارە گەڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر، لە هاوسەنگییەکی هێندە ورد و تەواودایە کە تەنانەت بە ئەندازەی سەری پەنجەیەکیش سەر و خوار ناکات و، هەموویان بە یەك پێوانەی ڕێکوپێك پێوراون. کە ئەمەش دەبێت بە بەڵگە لەسەر زانستێکی دەورەدەر بە هەموو شتێك.

بەو واتایەی:

هەموو ئەو شتانەی کە دەبن بە بەڵگە لەسەر بوونی"زانست"، لە هەمان کاتدا بەڵگەشن لەسەر بوونی "زانایەکی ئاگادار"، چونکە سیفەتی بێ مەوسووف شتێکی مەحاڵە!

کەواتە هەموو بەڵگەکانی "زانستی ئەزەلی" بەڵگەشن لەسەر پێویستیی بوونی خوای گەورەی "زانا" بە هەموو شتێك.

● **بەڵگەی سێهەم** بریتییە لە:

(وَالْحِكَمُ الْقَصْدِيَّةُ الْعَامَّةُ).

واتە: چەند واتایەك کە بە" زانین"ەوە جێی مەبەستن، لە هەموو بەدیهاتوویەکدا ڕەچاو کراوە و خراوەتە ئەستۆی هەموو دەستە و تاقمێکی بەدیهێنراوی ئەم گەردوونەی کە هەمیشە دیاردەکانی بەدیهێنەرێتی و کارایی بەردەوام و ئاڵوگۆڕی سەرومڕ و ژیانبەخشین و سەرکارخستن و لەسەرکارلابردنی بەردەوامی تێدا دەستبەکارە و، هەریەك لەمانەش هێندە سوود و کارمەندییان لەخۆ گرتووە کە هەرگیز ناکرێ بخرێتە ئەستۆی "ڕێکەوت"ەوە. ئەوەتا بە چاوی خۆمان دەبینین کە ئەگەر کەسێك زانستێکی هەمەلایەنگری نەبێت هەرگیز ناگونجێ خاوەنی هیچ کام لەم کارانە و هیچ چەشنە بەدیهێنانێك بێت.

بۆ نموونە:

"زمان" کۆئەندامێکە لە نێوان سەد کۆئەندامی مرۆڤدا، کە ئەویش یەکێکە لە زیندەوەرە لە ژمارە بەدەرەکان.. دەبینی ئەم زمانە لە پارچە گۆشتێك زیاتر نییە، کەچی لە ڕێی ئەنجامدانی دوو ئەرکی گرنگی سەرشانیەوە دەبێت بە هۆی پەیدابوونی سەدان حیکمەت و سوود و بەروبووم. ئەو دوو ئەرکە گرنگەش:

**یەکەمیان:**

ئەنجامـــدانی ئەرکی چەشـــتنی خواردەمەنییەکـــانە. کە بـــریتییە لەوەی بە"زانین"وە جەستە و گەدە ئاگادار دەکاتەوە لە تام و چێژە جیاجیاکانی هەریەك لە جۆرەکانی خواردن و، پشکنیارێکی لێزانە بۆ شوێنەکانی لێنـان و کوڵانـدن و ئامادەکردنی میهرەبانیی خوایی.

**دووهەمیان:**

ئەنجامـــدانی ئەرکی گەیانـــدنی وشـــەکانە. کە لەوەدایە وەك وەرگێـــڕێکی دەستپاك و سەنتەرێکی پەخش و بڵاوکردنەوەی هەموو ئەو شتانەیە کە بە دڵ و گیان و مێشکی مرۆڤدا دێن و تێدەپەڕن.

خۆ هەموو ئەم ئەرکانەی کە "زمان" ڕایانـدەپەڕێنێت، بەڵـگەیەکی لەوپەڕی ڕوونی و بێگومانیدایە لەسەر بوونی زانستێکی گشتگیر.

جـا ئەگەر تەنهـا یەك زمـان تـا ئەم ڕادەیە و بەو حـیکمەت و سـوودانەی تیایدایە ببێت بە بەڵگە لەسەر "زانست"، ئەوا بێگومان زمانە لەژمارەبەدەرەکان و زیندەوەرە بێسنوورەکان و بەدیهاتووە زۆر و زەبەنـدە و لەبـن نەهاتووەکـان، لە ڕووناکیی خۆر زیاتر و ڕوونـاکتر دەبـن بە بەڵـگە و، شـایەتیی ڕوونـتر لەچـاو ڕۆژی ڕووناك دەدەن لەسەر "زانستێکی بێکۆتایی" و، بە ئاشـکرا ڕایـدەگەیەنن کە هیچ شتێك لە بازنەی زانستی غەیب و ویستی خوای گەورە بەدەر نییە.

● **بەڵگەی چوارەم کە بریتییە لە:**

(وَالْعِنَايَاتُ الْمَخْصُوصَةُ الشَّامِلَةُ).

واتە: جۆرەکانی چاودێری و شەفەقەتی تایبەت و لەبار و شـیاو بـۆ هەمـوو "جۆر" بەڵکو بۆ هەموو "دانە"یەکی سەرجەمی جیهـانی زینـدەوەران و خـاوەن هەست و نەستەکان، بەوپەڕی ڕوونی بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسـەر "زانسـتێکی گشتگیر" و، چەند شایەتییەکی بێسنوور دەدات لەسەر بوونی زانایەکی خـاوەن

چاودێری کە ئاگای لـە هەمـوو ئەو بەدیهـاتووانەیە کە چـاودێرییان ئاراسـتە کراوە و، بە پێداویستییەکانیان دەزانێت.

**"بێدارکردنەوەیەك"**

(ڕوونکـردنەوەی وشـەکانی ئەو بـڕگە عەرەبیـیەی کە پـوختەی پەیامەکانی نـوورە، کە ئەویـش لە قورئـانی پیـرۆزەوە سـەرچاوەی گرتـووە، بە مەبەستی ئاماژەکردنە بۆ بەهرەمەندبوونی پەیامەکانی نـوور لەو ڕاسـتییانەی کە لە بریسـکانەوەی ئایەتەکـانی قورئـانی پیـرۆزەوە دەرکەوتـوون، بە تـایبەت ئەو بەڵگانەی کە تایبەتن بە سیفەتەکانی "زانست" و "ویست" و"توانست"ی خـوای گەورەوە، بە ڕادەیەك کە بە گرنگـی پێـدانێکی زۆرەوە ئەو بەڵـگە زانسـتییانەیان لێکداوەتەوە کە ئەم وشە عەرەبییانە ئاماژەی بۆ دەکەن. بەو واتایەی کە هەریەك لە وشەکانی ئەو بڕگە عەرەبییە بۆ ڕوونکـردنەوەی سـەرنجێك یـان ئامـاژەیەکی چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە. دەنا تەفسـیر و ڕوونکـردنەوە و وەرگێـڕانی ئەو وشە عەرەبییانە نییە).

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان.

بەڵێ، بە چاوی خۆمان دەبینین کە زانایەکی میهرەبان هەیە دەمانناسـێت و ئاگای لە حاڵی ئێمە و حاڵی هەموو گیانلەبەرانە و، شـەفەقەت و پارێزگـاریی ئەو هەموویـان دەگـرێتەوە و، بە زانـین و بەسـیرەت دەیانخـاتە ژێـر سـایەی میهرەبانیی خـۆی و، پێداویسـتی و داواکـاریی هــەموو یەکێکیـان جێبەجـێ دەکات و، بە چاودێری و میهرەبانی فریاگوزاریی هەموو یەکێکیان دەکات.

لە نێوان نموونە لەسنوور بەدەرەکانی ئەمەدا، تەنها یەك نموونە دەهێنینەوە:

چـاودێرییە تـایبەتی و گشـتییەکان، لە ڕووی ڕۆزیـی مـرۆڤ و پێداویسـتییەکانیەوە لە دەرمـان و کانزاکـان، بە ڕوونی "زانسـتێکی گشـتگیر" دەردەخەن و، بە ژمارەی ڕۆزی و دەرمان و کانزاکان شایەتی لەسەر بەخشندەی میهرەبان دەدەن.

بەڵێ، ژیاندنی مرۆڤ، نەخوازەڵا کەسانی دەستەوسان و بچووکە لاوازەکان، بە تایبەتی ناردنی ڕۆزی لە کوڵاندنگە(مطبخ)ی گەدەوە بۆ ئەو ئەندامانەی جەستە کە پێویستیان بە ڕۆزییە، تەنانەت بۆ خانۆچکەکانیش، هەریەکەیان بەپێی پێویست و گونجاو..

هەروەها دانانی چیا مەزنەکان بە گەنجینەی کانزاکان و عەمباری ئەو دەرمانانەی کە مرۆڤ پێویستی پێیانە..

ئەمانە و کارە سەرانسەر داناییەکانی تری وەك ئەمانە، بە بێ "زانستێکی گشتگیر و دەورەدەر بە هەموو شتێك" هەرگیز ناکرێ ئەنجام بدرێت. "ڕێکەوت"ی هەڕەمەکی و، "هێز"ی کتوکوێر و، "سروشت"ی کەڕوکاس و، "هۆکار"ە وشك و بێهەستەکان و، "توخم"ە ساکارە زاڵەکان، هەرگیز هیچ کامیان ناتوانن خۆیان لەم ژیاندن و بەڕێوەبردن و پارێزگاری و کارسازییانەدا هەڵبقورتێنن کە بە زانست و بینین و دانایی و میهرەبانی و چاودێری ئەنجام دەدرێن..

کەواتە ئەو هۆکارە ڕواڵەتییانە لە پەردە زیاتر نین لە بەردەم عیزەتی توانستی خوای گەورەدا، کە بە فەرمان و ئیزنی خاوەن زانستی ڕەها و، لە بازنەی زانست و دانستی ئەودا ئەو ڕۆڵەیان پێ بەخشراوە.

● **بەڵگەی پێنجەم و شەشەم** کە بریتییە لە:

(وَالأَقْضِيَةُ الْمُنْتَظَمَةُ.. وَالأَقْدَارُ الْمُثْمِرَةُ).

واتە: شێوەی هەموو شتێك، بە تایبەتی شکڵ و شێوە و ئەندازەی ڕووەك و درەختەکان و زیندەوەران و مرۆڤ، تابڵێی بە وردی و بەپێی دەستوورەکانی هەر دوو جۆری زانستی ئەزەلی (واتە قەزا و قەدەر) بڕاون و، پڕ بە پڕی قەد و باڵای هەریەکەیان بە خشتی و ڕێکی دووڕراوە و، لەبەریان کراوە و، شێوەیەکی هێندە ڕێکوپێکیان پێ دراوە کە لەوپەڕی داناییدایە.

جــا یەك بە یەكی ئەم شــتانە و هەمووشــیان پــێکەوە، بەڵــگەن لەســەر "زانست"ێکی بێکۆتایی و، بە ژمارەی هەمووشیان شایەتن لەسەر بەدیهێنەرێکی زانا.

با لە نێوان نمــوونە لەژمــارە بەدەرەکــانی ئەمەدا تەنهــا یەك دانە (تەنهــا یەك درەخت.. یان تەنها یەك مرۆڤ) بە نموونە بهێنینەوە:

دەبینین کە سنوورەکانی ڕووی ئاشکرا و پەنهــانی ئەم درەخــتە بەردارە، یــان ئەم مرۆڤەی کە گەلێ کۆئەندامی لەخــۆدا هەڵگرتــووە، بە پرگــاڵێکی غەیبــی و قەڵەمی زانستێکی ورد کێشراوە، چــونکە بە ڕێکــوپێکییەکی تەواو شــێوەیەك بە هەموو یەکێك لە ئەندامەکانی بەخشراوە کە بەروبــووم و ئەنجامەکــانی بەرهەم بهێنێت و ئەرکە سروشتییەکانی ئەستۆی ئەنجام بدات.

جا لەبەر ئەوەی ئەم کارە بە بێ "زانستێکی بێسنوور" هەرگیز ڕوو نــادات و نایەتەدی، ئەوا پێویســتی بە زانســتێکی بێســنووری بەدیهێــنەرێکی وێنەکــێش و زانا و خاوەن تەقدیری ڕەهایە، کە پەیوەندیی نێــوان هەمــوو شــتێك بزانێــت و، حساب بۆ پەیوەندیی نێوان هەر شتێك بە شتانی تــرەوە بکــات و، لە ســەرجەم هاوشێوەکانی تری ئەم درەخت و مرۆڤە و هەموو جۆرەکانیان ئاگادار بێــت و، بە پرگال و قەڵەمی قەزا و قەدەری زانستی ئەزەلیــی خــۆی ئەنــدازەکانی ڕووی ناوەوە و دەرەوەیان و شکڵ و شێوەیان بە تەقدیرێکی دانایــانە و بە بەســیرەت و زانست بکێشێت. واتە: بەڵگە و شــایەتەکان لەســەر پێویســتیی بــوونی خــوای گەورە و زانستی ڕەهای ئەو، بە ئەندازەی ژمارەی ڕووەکەکان و زیندەوەرانن.

● **بەڵگەی حەوتەم و هەشتەم** کە بریتین لە:

(وَالآجَالُ الْمُعَيَّنَةُ وَالأَرْزَاقُ الْمُقَــنَّــنَــةُ).

"ئەجەل" و "ڕۆزی"یەکان بە ڕواڵەت وا دەردەکەون کە دوو شتی تەماوین و دەستنیشان نەکراون، کەچی لە ژێر پەردەی ئەو بارە تەمــاوییەدا هەردووکیــان لە

دەفتەری قەزا و قەدەری ئەزەلی و لە لاپەڕەی شتانی تەقدیرکراوی ژیاندا تۆمار و دەستنیشان کراون.

کەواتە "ئەجەل"ی حەتمیی هەریەك لە زیندەوەران دیاری و دەستنیشان کراوە، تەنانەت بۆ یەك دانە سەعاتیش پێش ناخرێت و دوا ناکەوێت..

"ڕۆزی"ی هەموو گیانلەبەرێکیش دەستنیشان و تایبەت کراوە و لە تۆماری قەزا و قەدەردا نووسراوە.

گەلێ بەڵگەی لە سنوور بەدەر لەسەر ئەم بڕیارە هەیە. یەکێك لەوانە ئەمەی خوارەوەیە:

مردنی درەختێکی گەورە و بە میرات هێشتنەوەی ئەرکی سەرشانی لە تۆوە بچووکەکانیدا - کە وەك جۆرە "گیان"ێك وان سەبارەت بەو - تەنها بەپێی یاسایەکی دانایانەی کەسێکی زانا و پارێزگار نەبێت هەرگیز ئەنجام نادرێت..

هەروەها ئەو شیرە پوخت و خاوێنەی کە وەك ڕۆزییەك لە مەمکی دایکانەوە بۆ منداڵ و بێچوان و لە نێوان خوێن و سیخوڕی زیندەوەردا - بێ تێکەڵبوون - هەڵدەقوڵێت و، هاتنی بە پوختی و خاوێنی و خوڕبوونەوەی بەرەو دەمی ئەو ساوا و بێچووانە، زۆر بە توندی گریمانی "ڕێکەوت" پووچەڵ دەکاتەوە و، هاتنەدیی بەو شێوە بێگومانە ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو کارە ئەنجامی دەستوورێکی بەشەفەقەتە کە لە لایەن ڕۆزیدەرێکی زانا و میهرەبانەوە دانراوە.

بۆ خۆت زیندەوەران و گیانلەبەرانی تر بۆ سەر ئەم دوو نموونەیە قیاس بکە و بەم پێوەرە لێکیان بدەرەوە.

کەواتە لە ڕاستیدا هەریەك لە "ئەجەل " و "ڕۆزی" دەستنیشان کراون و، لە تۆماری شتانی تەقدیر کراودا نووسراون. بەڵام بە ڕواڵەت وا دەردەکەوێت کە لە پشت پەردەی غەیبەوە شاررابنەوە و خۆیان بە تاڵە دەزووە نادیارەکانی پەنهانیدا هەڵواسیبێت و، وا پیشان دەدەن کە دەستنیشان نەکرابن، وەك بڵێی بەسترابن بە "ڕێکەوت"ەوە..

هەموو ئەمانە، لەبەر حیکمەتێکی تا بڵێی ورد و لە هەمان کاتیشدا تـا بڵێـی گرنگ، کە ئەمەی خوارەوەیە:

ئەگەر بە ئاشکرا و بە چەشنی ئاوابوونی خـۆز کـاتی "ئەجەل" دیـار بـوایە، ئەوا مرۆڤ نیوەی یەکەمی تەمەنی بە بێئاگاییەکی تەواوەتی بەسـەر دەبـرد و ئەم بەشەی ژیانی بە زایە دەدا و پشـتی لە ئاخیرەت هەڵدەکرد. نیوەکەی تریشـی بە ترس و بیم دەبردە سەر و، وەکو ئەو کەسەی لـێ دەهـات کە هەمـوو ڕۆژێـك هەنگاوێکی نوێ بەرەو داری سێدارەکەی بنێت! دیـارە ئەو کـاتەش موسـیبەتی "ئەجەل" بە سەدان جار دووبارە دەبووەوە!

هەر لەبەر ئەم نهێنییە وردەیە کە ئەو موسیبەتانەی هەردەم لە ژیاندا دێنە ڕێی مرۆڤ، لە ژێـر پەردەی غەیبـدا داپۆشـراون، تەنـانەت ئەجــەلی دنیـاش - کە قیامەتە - خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی و لەبەر هەمان هۆ لە پشـت پەردەی غەیبەوە شاردوویەتیەوە.

هەرچـی "ڕۆزی"شــە ئەوا لەبەر ئەوەی کە لە دوای نـیعمەتی "ژیــان" بە مەزنترین گەنجینەی ئەوتۆ دادەنرێت کە پـڕە لە نیعمەتەکـانی تـر و، بەپیتـترین ســەرچاوەیە کە حەمـد و شــوکری لـێ هەڵـدەقوڵێت و، گشـتیترین کـانی بەندایەتی و پاڕانەوە و جۆرەکانی هیوا و ئومێدە، ئەوا بە ڕواڵەت وا پـێش چـاو خراوە کە نادیار بێـت و، بە "ڕێـکەوت"ەوە بەسـترابێت، ئەمەش بـۆ ئەوەی کە هیچ کات دەرگای پاڕانەوە لە ڕۆزیدەری بەخشندە و دەرگای تکا و لاڵانەوەی ئاوێتەی حەمد و شوکری خوای گەورە، لە ڕووی مرۆڤدا دانەخرێت..

چـونکە ئەگەر بە وێـنەی کـاتی هەڵهـاتن و ئـاوابوونی خـۆر "ڕۆزی"ش دەستنیشـانکراو بـوایە، ئەوا حەقـیقەت و مـاهیەتەکەی بە تەواوی دەگـۆڕا و، هەموو دەرگاکانی هیوا و ئومێد و پەنجەرەکانی لالانەوە و پلیکانەکانی دوعـا و نزای ئاوێتەی شـوکرانە و ڕەزامەنـدی، لە بەردەم مرۆڤـدا دادەخـران. تەنـانەت

سەرجەمی دەرگاکانی بەندایەتیی پڕ لە خشووع و لالانەوەی بەکوڵ، بە تەواوی، لە ڕوویدا دەبەستران!

● **بەڵگەی نۆهەم و دەهەم کە بریتین لە:**

(وَالْاتْقَانَاتُ الْمُفَنَّنَةُ.. وَالْاهْتِمَامَاتُ الْمُزَيَّنَةُ).

واتە: هەریەك لەو بەدیهاتووە جوان و ڕەنگینانەی کە لەسەر ڕووی زەویدا بڵاو بوونەتەوە، بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا، درەوشانەوەکانی جوانییەکی هەمیشەیی و هەتاهەتایی دەردەخەن.

بۆ نموونە:

گوڵ و بەروبوومەکان و، وردیلە باڵدار و مێرووەکان، بە تایبەتی ئەوانەی کە دەبریسکێنەوە، هێندە کارامەیی دەراسا و، سنعەتی ورد و، وردەکاریی ناوازە و، کەماڵی ئیعجازبەخشی بەدیهێنەری شکۆمەندیان لە ڕوخسار و کۆئەندامەکانیاندا هەیە کە لە ناوەندی چەند شکڵ و شێوەیەکی جۆراوجۆر و لە چەند مەکینەیەکی ورددا دانراون و، دەبن بە بەڵگەی گومانبڕ لەسەر زانستێکی هەمەلایەنگر و سەلیقەیەکی زانستیی خاوەن هونەر و کارامەیی..

هەروەها شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە دەستتێوەردانی "ڕێکەوت" و "هۆکار"ە ناساز و بێهەستەکان کارێکی سەرتاپا مەحاڵە.

دەستەواژەی: "الْاهْتِمَامَاتُ الْمُزَيَّنَةُ"ش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو بەدیهاتووە جوانانە هێندە ئارایشتی ناسك و شیرین و ڕازاندنەوەی نایاب و جوانیی سەرنج ڕاکێشی سنعەتیان تێدایە کە بەدیهێنەریان هەر کارێك دەکات بە زانستێکی بێکۆتایی ئەنجامی دەدات و، جوانترین و ناسکترین حاڵەت بۆ هەموو شتێك دەزانێت و، دەیەوێ جوانیی کەماڵی داهێنان و کەماڵی جوانیی خۆی بۆ خاوەن هەستان دەربخات. بە ڕادەیەك کە کاتێ بچووکترین گوڵی جوزئی و بچووکترین مێروو دروست دەکات بە بایەخپێدانێکی لەڕادەبەدەر و کارامەییەکی زۆر و وردەکارییەکی ناوازە شێوەی دەکێشێت!

جـا ئەم ڕازانـدنەوە و ئارایشـتدانەی کە بە چـاودێری و بـایەخەوە ئەنجـام دەدرێت، بە ڕوونی بەڵگەیە لەسەر زانسـتێکی گشـتگیر و دەورەدەر بە هەمـوو شتێك و، بە ژمارەی هەموو ئەو بەدیهاتووە جوانانە، شـایەتە لەسـەر پێویسـتیی بوونی بەدیهێنەرێکی زانا.

● **بەڵگەی یازدەهەم**، کە پێنج بەڵگەی لەخۆ گرتووە:

(وَغَايَةُ كَمَالِ الْانْتِظَامِ وَالْاتِّزَانِ وَالْامْتِيَازِ الْمُطْلَقَاتِ فِي السُّهُوْلَةِ الْمُطْلَقَةِ..
وَخَلْقُ الْأشْيَاءِ فِي الْكَثْرَةِ الْمُطْلَقَةِ مَعَ الْإتْقَانِ الْمُطْلَقِ..
وَفِي السُّرْعَةِ الْمُطْلَقَةِ مَعَ الْاتِّزَانِ الْمُطْلَقِ..
وَفِي الْوُسْعَةِ الْمُطْلَقَةِ مَعَ كَمَالِ حُسْنِ الصَّنْعَةِ..
وفِي الْبُعْدَةِ الْمُطْلَقَةِ مَعَ الاتِّفَاقِ الْمُطْلَقِ..
وفِي الْخِلْطَةِ الْمُطْلَقَةِ مَعَ الْامْتِيَازِ الْمُطْلَقِ).

ئەم بەڵـگەیە داڕشـتنێکی تـرە بـۆ هەمـان بەڵـگەی کە لە کۆتـایی بـڕگە عەرەبییەکەی پێشوودا باس کرا و، لەویش جوانترە و، ڕوونکردنەوەی ئەو پێـنج شەش بەڵگە فراوانەی لەخۆ گرتووە. وا لەبەر نەخۆشییە سەختەکەم ئاماژەیەکی یەکجار پوخت و کورتی بۆ دەکەین:

**یەکەم:**

بە چاوی خۆمان لە هەموو شوێنێکی سەر زەویـدا دروسـتکردنی چەنـدین مەکیـنەی سەرسـووڕهێنەر دەبینـین کە بەوپەڕی ئاسـانی و بە یەك جـار لە سەرچاوەی زانستێکی کامـڵ و کـارامەییەکی تەواو بەدی دەهێـنرێن، تەنـانەت هەنـدێکیان بە شـێوەیەکی ڕێکوپێـك و کێشـانەکراو، هـاودەم لەگەڵ جیـاکردنەوەشی لە هاوشـێوەکانی، لە مـاوەی تەنهـا یەك خولەکـدا دروسـت دەکرێن..

ئەمەش بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر زانستێکی نەبڕاوە و، بە ئەندازەی سووك و ئاسانیی ئەو کارامەییە زانستییەی کە لەو سنعەتەدا هەیە بەڵگەشە لەسەر کەماڵی ئەو زانستە.

**دووهەم:**

دروستکردنی بەدیهاتووان لە ناوەندی زۆرییەکی بێسنووردا، بەوپەڕی وردی و بێ هیچ هەڵە و سەر لێ تێکچوونێك، بەڵگەیە لەسەر زانستێکی بێسنوور لە ناوەندی توانستێکی بێکۆتاییدا و، چەندین شایەتیی بێسنوور و نەبڕاوە دەدات لەسەر بەدیهێنەری خاوەن زانست و توانستی ڕەها.

**سێهەم:**

بەدیهێنانی ئەو بوونەوەرانەی کە بە سەنگ و تەرازووی ورد و لەوپەڕی خێراییدا بەدی دەهێنرێن، بەڵگەیە لەسەر زانستێکی بێسنوور و، بە ژمارەی هەمووشیان شایەتە لەسەر خوایەتیی بەدیهێنەری خاوەن زانست و توانستی ڕەها.

**چوارەم:**

بەدیهێنانی زیندەوەرانی لەژمارەبەدەر، لە فراوانییەکی هێندە ڕەهادا کە سەرانسەری زەوی بگرێتەوە، لە ناوەندی وردەکاریی سنعەت و جوانترین ئارایشت و کەماڵی جوانیی بەدیهێناندا، بەڵگەیە لەسەر زانستێکی گشتگیر و دەورەدەر بە هەموو شتێك، کە ڕێی لێ ون نابێت و هیچ شتێکی لەبیر ناچێت و، بە یەك جار هەموو شتان دەبینێت و، هیچ شتێك ڕێی شتێکی تری لێ ناگرێت.

هەروەها هەموو یەکێکی ئەو بوونەوەرانە و هەمووشیان پێکەوە شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە دروستکراوی کەسێکن بە هەموو شتێك زانا و بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

**پێنجەم:**

بەدیهێنـانی دانە بە دانەی ئەو جـۆرە بەدیهـاتووانەی کە مـاوەیەکی تـابڵێی فراوان و زۆریان لە نێواندایە، بۆ نموونە: یەکێکیان لە خـۆرهەڵات و یەکێکیـان لە خـۆرئاوا و، یەکێك لە باکوور و یەکـێکی تریـان لە باشـووردایە، لە هەمـان کاتدا و بە هەمان شکڵ و شـێوەی لەیەکچـوو، هـاودەم لەگەڵ جیـابوونەوەی کەسـایەتیی سـەربەخۆی هەریەکەیـان لەوی تریـان، هەرگیـز نـاکرێ ئەنجـام بدرێت گەر بە توانای خاوەن توانستێکی هێندە ڕەها نەبێـت کە بەو توانسـت و زانستە ڕەهایەی خۆی، دەوراندەوری هەموو بوونەوەران و بارودۆخیـانی داوە، سەرانسەری گەردوون بەڕێوە دەبات.

لەبەر ئەوە، ئەو بەدیهـاتووانە چەنـد شـایەتییەکی بێسـنوور دەدەن لەسـەر زانسـتێك کە دەورانـدەوری هەمـوو شـتێکی داوە و، لەسـەر بـوونی زانـای ئاگاداری هەموو شتە پەنهانەکان.

**شەشەم:**

بەدیهێنانی گەلێ مەکینەی زیندوو کە بە نیشانەی جوداکەرەوە هەریەکەیـان لەوانی تر جیا کـراوەتەوە، لە کاتێکـدا کە لە ناوەنـدی جەنجـاڵییەکی زۆر و لە چەنـدین شـوێنی تاریکـدان (وەك تۆوەکـانی ژێـر خـاك) بە بـێ هـیچ لـێ تێکچوون و هەڵە و سەرگەردانییەك، هەرچەندەش تێکەڵی یەکترین.. هەروەهـا بەدیهێنانی کۆئەندامەکانی هەموویـان بە شـێوەیەکی سەرتاسـەر ئیعجـاز و بـێ هـیچ نـاتەواوییەك.. بەڵـگەیەکی ڕوون و ئاشـکرای وەك خـۆر وایە لەسـەر "زانسـتێکی ئەزەلی" و، شـایەتییەکی ڕوونی چەشـنی ڕۆژی ڕۆشـنا لەسـەر پەروەردگاری و بەدیهێنەرێتیی خاوەن توانست و زانستێکی ڕەها دەدات.

ئەم باسە یەکجـار درێژەمـان بەم جـۆرە کـورت کـردەوە و، درێژەپێـدانی بە پەیامەکانی نوور دەسپێرین.

* * *

ئێستا دەست بە مەسەلەی "ویست"ی خوایی دەکەین کە لە "خلاصة الخلاصة"دا هەیە:

(اللّٰهُ أكبَرُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ قُدْرَةً وَعِلْماً.. إذْ هُوَ الْمُرِيْدُ لِكُلِّ شَيْءٍ، مَا شَاءَ اللّٰهُ كانَ وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ؛ إذْ تَنْظِيْمُ إيْجَادِ الْمَصْنُوْعَاتِ ذَاتاً وَصِفَاتٍ وَمَاهِيَّةً وَهُوِيَّةً مِنْ بَيْنِ الْامْكانَاتِ الْغَيْرِ الْمَحْدُوْدَةِ وَالطُّرُقِ الْعَقِيْمَةِ وَالاحْتِمَالاتِ الْمُشَوَّشَةِ وَالْأمْثَالِ الْمُتَشَابِهَةِ وَمِنْ بَيْنِ سُيُولِ الْعَنَاصِرِ الْمُتَشَاكِسَةِ بِهٰذَا النِّظَامِ الأدَقِّ الْأرَقِّ، وَتَوْزِيْنُهَا بِهٰذَا الْمِيْزَانِ الْحَسَّاسِ الْجَسَّاسِ، وَتَمْيِيْزُهَا بِهٰذِهِ الْأمْثَالِ الْمُتَشَابِهَةِ وَالتَّعَيُّنَاتِ الْمُزَيَّنَةِ الْمُنْتَظَمَةِ، وَخَلْقُ الْمَخْلُوْقَاتِ الْمُنْتَظَمَاتِ الْحَيَوِيَّةِ مِنَ الْبَسِيْطِ الْجَامِدِ الْمَيِّتِ كالإنْسانِ بِجِهَازَاتِهِ مِنِ النُّطْفَةِ وَالطَّيْرِ بِجَوَارِحِهِ مِنَ الْبَيضَةِ وَالشَّجَرَةِ بِأعْضَائِهَا مِنَ النَّوَاةِ وَالْحَبَّةِ، تَدُلُّ عَلَى أنَّ كُلَّ شَيْءٍ بِإرَادَتِهِ تَعَالَى وَاخْتِيَارِهِ وَقَصْدِهِ وَمَشِيْئَتِهِ سُبْحَانَهُ، كَمَا أنَّ تَوَافُقَ الْأشْيَاءِ في أسَاسَاتِ الْأعْضَاءِ النَّوْعِيَّةِ وَالْجِنْسِيَّةِ يَدُلُّ عَلَى أنَّ صَانِعَ تِلْكَ الْأفْرَادِ وَاحِدٌ أحَدٌ، كَذٰلِكَ أنَّ تَمَايُزَهَا بِالتَّعَيُّنَاتِ الْمُنْتَظَمَةِ وَالتَّشَخُّصَاتِ الْمُتَمَايِزَةِ يَدُلُّ عَلَى أنَّ ذٰلِكَ الصَّانِعَ الْوَاحِدَ الْأحَدَ فَاعِلٌ مُخْتَارٌ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ وَيَحْكُمُ مَا يُرِيْدُ).

ئەم بڕگەیە تەنها یەك بەڵگەی دوور و درێژ و هەمەکیی نێوان بەڵگەکانی "ویستی خوایی"یە و، گەلێ بەڵگەی زۆر و زەبەندەی لەخۆ گرتووە.

وا لە نێوان پوختە وەرگێڕانێکی ناوەڕۆکەکەیدا بەڵگەیەك ڕوون دەکەینەوە کە بە جۆرێکی گومانبڕ ویست و ئیختیاری خوای گەورە دەچەسپێنێت. وێڕای ئەوەی کە هەموو ئەو بەڵگانەی بۆ "زانستی خوایی" باس کران، لە خۆیاندا بەڵگەشن لەسەر "ویستی خوایی". چونکە درەوشانەوەکانی "زانست" و "ویست"ی خوایی پێکەوە لە هەموو بەدیهاتوویەکدا دەبینرێن.

**پوختە واتاکەی ئەم بڕگە عەرەبییە، ئەمەیە:**

هەموو شتێك بە "ویست"ی خوای گەورە پەیدا دەبێت؛ کەواتە هەر شتێك ئەو ویستی لەسەری بوو، دەبێت و.. هەر شتێك ئەو ویستی لەسەری نەبوو، نابێت. هەر شتێکی بوێت دەیکات، بەڵام هیچ شتێك خاوەنی "بوون" نابێت ئەگەر ئەو ویستی لەسەر بوونی نەبێت.

ئەمەی خوارەوە یەکێکە لە بەڵگە زۆرەکانی ئەم ڕاستییە:

دەبینین هەریەك لەم بەدیهاتووانە زاتێکی جیاواز و سەربەخۆی دراوەتێ و، سیفەتێکی تایبەت و ماهیەتێکی تایبەت بە خۆی هەیە و، شێوە و شەقڵێکی پێ دراوە کە نیشانەی جوداکەرەوە و جیاوازی خۆی هەیە..

جا لە کاتێکدا کە دەگونجێ هەریەك لەم حاڵەتانەی باس کران لە نێوان چەندین گریمانی سەر لێ تێکدەری بێسنووردا سەرگەردان بێت و، بەناو چەند ڕێیەکی زۆری نەزۆکدا بڕوات و، لافاوی توخمەکان و شتەکانی وەك ئەو خۆیان لەو کارەدا هەڵبقورتێنن، لەوانەی کە هۆکاری هەڵە و لێ تێکچوونن، کەچی وێڕای هەموو ئەم حاڵەتە تێکەڵ و شڵەژاوانە، دەبینین ئەو بەدیهێنراوە لە ناوەندی یاسایەکی ورد و ڕێکوپێك و تەرازووکراودا بەدی دەهێنرێت و، هەریەك لە ئەندام و کۆئەندامەکانی بەپێی سەنگ و تەرازوویەکی تەواو هەستیار دروست کراوە و شوێنی خۆی گرتووە و، کۆمەڵێ ئەرکی خراوەتە ئەستۆ و، دەم و چاویشی سیمایەکی سەربەخۆی ڕازاوە و جوانی دراوەتێ و، ئەندامە جیا جیا و لەیەك نەچووەکانیشی لە ماددەیەکی ساکاری بێگیانی مردوو، بە زیندوویی و وردەکاری دروست دەکرێن، بە وێنەی دروستکردنی مرۆڤێکی کامڵی خاوەن سەدان کۆئەندامی جۆراوجۆر و لە یەك نەچوو، لە شێوەیەکی پڕ لە ئیعجازدا و تەنها لە یەك دڵۆپ ئاو.

هەروەها بەدیهێنانی باڵندە لە چەند ئەندام و کۆئەندامی جۆراوجۆر لە هێلکەیەکی ساکار..

دروستکردنی درەختێك بە هەموو لق و پەلە تێکئاڵاوەکانی و سەرجەم بەشە جیاجیاکانی، تەنها لە تۆوێکی بچووك، کە ئەویش لە چەنـد شـتێکی سـاکاری وەك کاربۆن و ئازۆت(نایترۆجین) و ئۆکسـجین و هایـدرۆجین پێکهـاتووە و، بەخشـینی شـکڵ و شـێوە و ڕوخسـارێکی ڕێکوپێـك و بەرهەمـبەخش بەو درەختە..

هەمـوو ئەمـانە، بە ڕوونی و بێگومـانی، تەنـانەت تـا ڕادەی "پێویسـتی و زەروورەت" بەڵـگەن لەسـەر ئەوەی کە ئەم بـارودۆخە کامـڵ و تـایبەتەی ئەو بەدیهـاتووە و، هەمـوو گەردیلەکـانی و، سـەرجەم کۆئەنـدامەکان و شـێوە و ماهییەتیشی، بە "ویسـت"ی کەسـێکی بەتوانـای خـاوەن توانسـتی ڕەهـا و، بە ئیختیار و مەبەسـتی ئەو پێی دەبەخشـرێن و، بەڵـگەن لەسـەر ئەوەش کە ئەو بەدیهـاتووە ملـکەچ و گـوێڕایەڵی "ویسـت"ێکی ئەوتـۆیە کە هەمـوو شـتێك دەگرێتەوە.

ئنجا بەڵگەی بێگومانی ئەم یەك دانە بەدیهـاتووە لەسـەر "ویسـتی خـوایی" دەریدەخات کە سـەرجەمی بەدیهـاتووان، بە ژمـارەی خۆیـان و بە چەشـنێکی ڕوون و بێگومـانی چەشـــنی خـۆری ئاســمان و ڕۆژی ڕۆشـنا، شـایەتییەکی ڕاست و ڕەوان و بێکۆتایی دەدەن لەسەر "ویستی خـوایی" کە هەمـوو شـتێکی گرتووەتەوە و، بریتین لە چەنـد بەڵـگەیەکی لەبـن نەهـاتوو لەسـەر پێویسـتیی بوونی بەتوانایەکی خاوەن ویست و مەبەست و ئیختیار.

پاشان هەموو بەڵگەکانی"زانست" کە پێشـتر بـاس کـران، لە هەمـان کاتـدا بەڵگەشـن لەسـەر "ویسـتی خـوایی". چـونکە هەردووکیـان لەگەڵ "توانسـتی خوایی"دا پێکەوە کار دەکەن و هیچ کات لە یەکتری دانابڕێن.

جا هەروەك لەیەکچـوونی ئەنـدامەکانی جـۆر و ڕەگەزی یەك بە یەکی ئەو جۆر و ڕەگەزە، بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە بەدیهێـنەری هەموویـان کەسـێکی تاك و تەنیایە، بە هەمان جۆر جیـاوازیی بە حـیکمەت نەخشـاوی ڕوخسـارەن

دەموچاویان بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر ئەوەی کە ئەو بەدیهێنەرە تاك و تەنیایە بکەرێـکی خـاوەن ئیختیـارە و، هەر شـتێك بەدی دەهێنێـت بە ویسـت و مەبەست و ئیختیاری خۆی دروستی دەکات.

بەم جۆرە، پوختە وەرگێڕانی ئەو بڕگە عەرەبییەی پێشوو کۆتایی پـێ هـات، کە بەڵگەیەکی هەمەکی و ناوازەیە لەسەر "ویستی خوایی".

* * *

نیازم وا بوو - وەك ئەوەی لە مەسەلەی "زانستی خوایی"دا ڕوونم کـردەوە - چەند سەرنجێکی گرنگ و تایبەت بە "ویستی خوایی"ش ڕوون بکەمەوە. بەڵام ئەو نەخۆشییەی کە لە ئەنجامی ژەهر دەرخـوارددانم تـووشی بـووم، مێشـکی ماندوو کردبووم. بۆیە بە ویستی خوای گەورە ئەو ڕوونکردنەوەیە بۆ کاتێکی تر دوا دەخەم.

* * *

ئەو بڕگەیەی کە تایبەتە بە "توانستی خوایی"یەوە، بریتییە لەمەی خوارەوە:

(اللّٰهُ أكْبَرُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ قُدْرَةً وَعِلْـماً إذْ هُـوَ الْقَـدِيْرُ عَـلَى كُـلِّ شَيْءٍ بِقُـدْرَةٍ مُطْلَقَةٍ مُحِيْطَةٍ ضَرُوْرِيَّةٍ نَاشِئَةٍ لازِمَةٍ ذَاتِيَّـةٍ لِلْـذَاتِ الأقْدَسِـيَّةِ. فَمُحَـالٌ تَـدَاخُلُ ضِدِّهَا، فَلا مَرَاتِبَ فِيهَا فَتَتَسَاوَىٰ بِالنِّسْبَةِ إلَيْهَا الذَّرَّاتُ وَالنُّجُوْمُ وَالْجُزْءُ وَالْكُـلُّ وَالْجُزْئِيُّ وَالْكُلِّيُّ وَالنَّوَاةُ وَالشَّجَرُ وَالْعَالَمُ وَالإنْسَانُ.. بِسِرِّ مُشَاهَدَةِ غَايَـةِ كَـمَالِ الانْتِظَامِ، الاتِّزَانِ، الامْتِيَازِ، الاتْقَانَ الْمُطْلَقَاتِ.. مَعَ السُّهُوْلَةِ فِي الْكَثْرَةِ وَالسُّرْعَةِ وَالْخِلْطَةِ الْمُطْلَقَةِ.. وَبِسِرِّ النُّوْرَانِيَّـةِ وَالشَّـفَافِيَّةِ وَالْمُقَابَلَـةِ وَالْمُوَازَنَـةِ وَالانْتِظَـامِ وَالامْتِثَالِ.. وَبِسِرِّ إمْدَادِ الْوَاحِدِيَّـةِ وَيُسْـرِ الْوَحْـدَةِ وَتَجَـلِّي الأحَدِيَّـةِ.. وَبِسِـرِّ الْوُجُوْبِ وَالتَّجَرُّدِ وَمُبَايَنَةِ الْمَاهِيَّةِ.. وَبِسِـرِّ عَـدَمِ التَّقَيُّـدِ وَعَـدَمِ التَّحَيُّـزِ وَعَـدَمِ

التَّجَزِّي.. وَبِسِرِّ انْقِلابِ الْعَوَائِقِ وَالْمَوَانِعِ إِلَى حُكْمِ الْوَسَائِلِ الْمُسَهِّلاتِ.. وَبِسِرِّ أَنَّ الذَّرَّةَ وَالْجُزْءَ وَالْجُزْئِيَّ وَالنَّوَاةَ وَالْإِنْسَانَ لَيْسَتْ بِأَقَلَّ صَنْعَةً وَجَزَالَةً مِنْ النَّجْمِ وَالْكُلِّ وَالْكُلِّيِّ وَالشَّجَرِ وَالْعَالَمِ، فَخَالِقُهَا هُوَ خَالِقُ هٰذِهِ بِالْحَدْسِ الشُّهُودِيِّ.. وَبِسِرِّ أَنَّ الْمُحَاطَ وَالْجُزْئِيَّاتِ كَالْأَمْثِلَةِ الْمَكْتُوبَةِ الْمُصَغَّرَةِ أَوْ كَالنُّقَطِ الْمَحْلُوبَةِ الْمُعَصَّرَةِ. فَلابُدَّ أَنْ يَكُونَ الْمُحِيطُ وَالْكُلِّيَاتُ فِي قَبْضَةِ خَالِقِ الْمُحَاطِ وَالْجُزْئِيَّاتِ لِيُدْرِجَ مِثَالَهَا فِيهَا بِمَوَازِينِ عِلْمِهِ أَوْ يُعَصِّرَهَا مِنْهَا بِدَسَاتِيرِ حِكْمَتِهِ.. وَبِسِرِّ كَمَا أَنَّ قُرْآنَ الْعِزَّةِ الْمَكْتُوبَ عَلَى الذَّرَّةِ الْمُسَمَّاةِ بِالْجَوْهَرِ الْفَرْدِ بِذَرَّاتِ الْأَثِيرِ لَيْسَ بِأَقَلَّ جَزَالَةً وَخَارِقِيَّةَ صَنْعَةٍ مِنْ قُرْآنِ الْعَظَمَةِ الْمَكْتُوبِ عَلَى صَحِيفَةِ السَّمَاءِ بِمِدَادِ النُّجُومِ وَالشُّمُوسِ، كَذٰلِكَ أَنَّ وَرْدَ الزَّهْرَةِ لَيْسَتْ بِأَقَلَّ جَزَالَةً وَصَنْعَةً مِنْ دُرِّيِّ نَجْمِ الزُّهْرَةِ وَلا النَّمْلَةَ مِنَ الْفِيلَةِ وَلا الْمِكْرُوبَ مِنَ الْكَرْكَدَنِّ وَلا النَّحْلَةَ مِنَ النَّخْلَةِ بِالنِّسْبَةِ إِلَى قُدْرَةِ خَالِقِ الْكَائِنَاتِ. فَكَمَا أَنَّ غَايَةَ كَمَالِ السُّرْعَةِ وَالسُّهُولَةِ فِي إِيجَادِ الْأَشْيَاءِ أَوْقَعَتْ أَهْلَ الضَّلالَةِ فِي الْتِبَاسِ التَّشْكِيلِ بِالتَّشَكُّلِ الْمُسْتَلْزِمِ لِمُحَالاتٍ غَيْرِ مَحْدُودَةٍ تَمُجُّهَا الْأَوْهَامُ، كَذٰلِكَ أَثْبَتَتْ لِأَهْلِ الْهِدَايَةِ تَسَاوِيَ النُّجُومِ مَعَ الذَّرَّاتِ بِالنِّسْبَةِ إِلَى قُدْرَةِ خَالِقِ الْكَائِنَاتِ. جَلَّ جَلالُهُ، لا إِلٰهَ إِلاّ هُوَ، اللّٰهُ أَكْبَرُ).

پێش ئەوەی دەست بە ڕوونکردنەوەی پوختە ناوەرۆکی ئەم بڕگە عەرەبییە مەزنە بکەم، کە تایبەتە بە "توانستی خوایی"یەوە و، وەك وەرگێڕان و ناوەرۆکی ئەو بڕگەیە وایە، ڕاستییەك ڕوون دەکەمەوە کە هاتە دڵمەوە و، بریتییە لەمەی خوارەوە:

بوونی "توانستی خوایی" لە بوونی گەردوون بێگومانترە! تەنانەت هەموو بوونەوەران، بە تایبەت یەك بە یەکی بەدیهاتووان، چەند وشەیەکی بەرجەستەی ئەو توانستەن کە بە "عين اليقين" پێش چاوی دەخات و ئاشکرای دەکات و، بە

ژمارەی هەمووشیان بەڵگەن لەسەر "مەوسووف"ی ئەو سیفەتە کە خوای گەورەی خاوەن توانستی ڕەهایە. کەواتە هیچ پێویستییەك بە بەڵگەهێنانەوە ناکات بۆ چەسپاندنی بوونی "توانست"ی خوای گەورە، بەڵکو پێویست بە چەسپاندنی ڕاستییەکی مەزن دەکات کە تایبەتە بە "توانست" و، بناغەی گرنگی ئیمانە و، بەردی قایم و مەحکەمی بناغەی حەشر و نەشرە و، خولگەیەکی پێویستە بۆ گەلێ مەسەلەی ئیمانی و ڕاستیی مەزنی قورئان و، بریتییە لەو دەعوایەی کە قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا ڕایگەیاندووە:

﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ (لقمان:٢٨)..

کە ڕاستییەکە ژیرییەکان لە ئاستی ڕوونکردنەوە و پەی پێ بردنیدا دەستەوسان و سەرسام مان، تەنانەت هەندێکیشیان لە ڕێ ترازان و گومڕا بوون. جا ئەو بناغە و، بەردی سەرگۆشە و، خولگە و، دەعوا و، ڕاستییە، بریتییە لە واتای ئەم ئایەتە پیرۆزە.

واتە: ئەی گرۆی جیننی و ئادەمیزاد!

بەدیهێنانی هەمووتان پێکەوە و زیندووکردنەوەشتان لە ڕۆژی حەشردا هێندە بۆ توانستی خوا ئاسانە وەك ئاسانیی بەدیهێنانی یەك دانە کەس وایە. هەر ئەو توانستەیە کە بە وێنەی ئاسانیی بەدیهێنانی یەك دانە گوڵ سەرانسەری بەهاریش بەدی دەهێنێت. کەواتە سەبارەت بەو توانستەوە جیاوازی لە نێوان جوزئی و کوللی.. گەورە و بچووك.. کەم و زۆردا نییە و، بە وێنەی ئاسانیی بەڕێخستنی یەك دانە گەردیلە، هەسارەکان دەخاتەگەڕ.

جا ئەو بڕگە عەرەبییەی پێشوو، لە نۆ پلەدا و بە بەڵگەیەکی یەکجار بەهێز و گومان بڕ، ئەم مەسەلە مەعنەوی و گرنگە ڕوون دەکاتەوە.

ئەم بڕگەیەی خوارەوەش ئاماژە بۆ بناغەی ئەو پلانە دەکات و، بە پوختییەکی لەڕادەبەدەر ئەو بڕگە عەرەبییە کورت دەکاتەوە:

(إذْ هُوَ الْقَدِيْرُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ بِقُدْرَةٍ مُطْلَقَةٍ مُحِيْطَةٍ ضَرُوْرِيَّةٍ نَاشِئَةٍ لازِمَةٍ ذَاتِيَّةٍ لِلَّذَاتِ الأَقْدَسِيَّةِ. فَمُحَالٌ تَدَاخُلُ ضِدِّهَا، فَلا مَرَاتِبَ فِيهَا فَتَتَسَاوَىٰ بِالنِّسْبَةِ إِلَيْهَا الذَّرَّاتُ وَالنُّجُوْمُ وَالْجُزْءُ وَالْكُلُّ وَالْجُزْئِيُّ وَالْكُلِّيُّ وَالنَّوَاةُ وَالشَّجَرُ وَالْعَالَمُ وَالإِنْسَانُ).

واتە: هەر تەنها خوای گەورەیە کە بە توانستێکی گشتگیر و دەورەدەر بە هەموو شتێ تۆانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و، ئەو توانستە پێویستییەکی زاتی و واجبە - بە پێی زانستی مەنتیق - بۆ زاتی خوای گەورەی" واجب الوجود "، بە ڕادەیەك کە مەحاڵە ئەو سیفەتە لەو زاتە جیا ببێتەوە و، هەرگیز جیابوونەوەی لەو مومکین نییە..

جا مادەم ئەم چەشنە توانستە بەم ئەندازەیە بۆ زاتی خوای گەورە پێویستە، ئەوا بێگومان "دەستەوسانی" کە دژی "توانست"ە، هەرگیز لە هیچ لایەکەوە ئاوێتەی توانستی ئەو نابێت و، نایەتە ڕێی زاتی خاوێنی ئەو خوا گەورەیە..

لەبەر ئەوەی بوونی "پلە" لە هەرشتێکدا هی ئەوەیە کە دژەکەی ئاوێتەی ببێت، بۆ نموونە: پلەکانی "گەرمی" بە تێکەڵبوونی سەرما و، پلەکانی "جوانی"ش بە ئاوێتەبوونی ناشیرینی دەبێت، ئەوا مەحاڵە "دەستەوسانی" - کە دژی "توانست"ە - تێوخنی "توانستی زاتی"ی خوای گەورە بکەوێت. کەواتە توانستی ئەو خوایە پلەپلە نییە. جا لەبەر ئەوەی پلەپلە نییە ئەوا ئەستێرەکان و گەردیلەکان لە بەرامبەریەوە وەك یەك ئاسانن و، "کوللـ" و"جوزء".. سەرجەمی جۆری مرۆڤ و یەك دانە مرۆڤ.. تەنانەت سەرانسەری گەردوون، هەموویان سەبارەت بەو توانستە جیاوازییان نییە و، زیندووکردنەوەی یەك دانە ناوك و "درەختێکی" گەورە و، یەك دانە کەس و هەموو گیانلەبەران لە حەشری مەزندا بە لای ئەو توانستەوە یەکسانە و، هەموویان لای ئەو وەکو یەك ئاسانە. کەواتە جیاوازی ناکات لە نێوان گەورە و بچووك، کەم و زۆردا.

شـــایەتی ڕاســـت لەســـەر ئەم حەقـــیقەتە ئەوەیە کە بە چـــاوی خۆمـــان لە بەدیهێنانی شتاندا دەبیبنین کە لە کەمـــاڵی ســـنعەت و ڕێـــسا و تەرازوو و لە یەك جیاکردنەوە و، زۆری لە ناوەندی خێـــراییەکی ڕەهـــا و ئاســـانیی ڕەهـــا و تەواودا بەدی دەهێنرێن.

جا ئەم ڕاستییەی کە باسمان کرد، ناوەرۆکی **پلەی یەکەمە**، کە بریتییە لە:

(بِسِرِّ مُشَاهَدَةِ غَايَةِ كَمَالِ الْانْتِظَامِ، الْاتِّزَانِ، الْامْتِيَازِ، الْاتْقَـانَ الْمُطْلَقَـاتِ.. مَعَ السُّهُوْلَةِ فِي الْكَثْرَةِ وَالسُّرْعَةِ وَالْخِلْطَةِ).

**پلەی دووهەم، کە بریتییە لە:**

(وَبِسِرِّ النُّوْرَانِيَّةِ وَالشَّفَّافِيَّةِ وَالْمُقَابَلَةِ وَالْمُوَازَنَـةِ وَالْانْتِظَامِ وَالْامْتِثَالِ).

ڕوونکـــردنەوە و درێژەپێـــدانی ئەم پـــلەیە بە کۆتـــایی "وتەی دەهەم" و "وتەی بیست و نۆهەم" و "مەکتووبی بیستەم" دەســـپێرین و، لێـــرەدا تەنهـــا ئامـــاژەیەکی پوختی بۆ دەکەین:

بەڵێ، هەروەك ڕۆشتنی ڕووناکی و شێوەی خۆر - لە ڕووی نوورانێتییەوە - بۆ ناو ڕووی دەریا و بڵقە ئاوێکی سەر دەریا و پارچە شووشەیەك، بۆ توانســـتی خوای گەورە وەکو یەك ئاســـانە، بەدیهێنـــانی ئاســـمانەکان و ئەســـتێرەکانیش بـــۆ توانستی نوورانیی ئەو خوایەی کە "نُـــوُرِ الْأَنْـــوَارِ"ە، وەك بەدیهێنـــانی "مـــێش" و "گەردیلەکان" و بەگەڕخســـتنی ئەو گەردیـــلانە ئاســـانە و، هـــیچ شـــتێکی بەلاوە قورس و گران نییە.

هەروەهـــا وەك لە ڕووی تایبەتکـــاریی "ڕوونی"(الشَّـــفَّافِيَّة)یەوە، وێـــنەی میسالیی خۆر - بە توانستی خوای گەورە - لە ئـــاوێنەیەکی بچـــووك و بیلبـــیلەی چاودا بە ئاســـانی دەردەکەوێـــت، هەر بە هەمـــان ئاســـانی و بە فەرمـــانی خـــوای گەورە ئەو ڕووناکی و وێنەیەی خۆر بە هەمـــوو شـــتێکی بریســـکەدار و گشـــت دڵۆپە ئاوێك و سەرجەمی گەردیلە ڕوونەکان و ڕووی دەریاش دەبەخشرێت..

جا هەروەك ئەمانە بۆ توانستی خوای گەورە ئاسانن، ئەوا دەرکەوتنی "توانستی" ڕەهای خوای گەورە و کاریگەریی لە بەدیهێنانی یەك دانە کەس و سەرجەمی زیندەوەراندا بە هەمان ئاسانییە، چونکە ڕووی ماهییەت و مەلەکووت (واتە ڕووی مەعنەوی)ی بەدیهاتووان - کە ڕووی لە فەرمانی خوای گەورەیە - ڕوون و بریسکەدارە و، سەبارەت بەو توانستەوە جیاوازی لە نێوان کەم و زۆر و گەورە و بچووکدا نییە.

ئنجا هەروەك ئەگەر دوو دانە گوێز هەریەکەیان بخرێتە تایەکی تەرازوویەکی یەکجار هەستیاری ئەوتۆ کە بتوانێت چیاکان بکێشێت، پاشان ناوکێکی بچووك بخرێتە ناو یەکێك لەو دووتایەوە، ئەوا بە ئاسانی یەکێك لەو دوو تایە بەرەو لوتکەی چیایەك بەرز دەکاتەوە و تاکەی تریشی بەرەو بنکی شیوێکی قووڵ دادەبەزێنێت. خۆ ئەگەر لە بریی دوو گوێزەکە دوو چیای یەکسان دابنرێت، ئەوا بە هەمان ئاسانی و بە دانانی یەك ناوکی بچووك لە تایەکیاندا یەکێك لەو دوو چیایە بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە و ئەوی تریان بەرەو بنکی شیوەکان شۆڕ دەبێتەوە..

جا هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، ئەوا "ئیمکان"یش - وەك زانستی "کەلام" لێی دەدوێت - هەردوو لاکەی یەکسانە، واتە "بوون" و "نەبوون"ی شتانی مومکین و گریمانکراو - کە نە واجب و نە موستەحیلن - یەکسانە و، گەر هیچ هۆکارێك لە ئارادا نەبێت لایەکیان تەرجیح بدات، جیاوازی لە نێوان بوون و نەبوونیاندا نییە.

ئیتر لەم "ئیمکان" و "یەکسانی"ی بوون و نەبووندا: کەم و زۆر، **گەورە و** بچووك، یەکسانە..

بە هەمان جۆر، بوونەوەرانیش لە جۆری "مومکینات"ن. خۆ مادەم لە بازنەی "ئیمکان"دا بوون و نەبوونیان یەکسانە، ئەوا توانستی ئەزەلی و [illegible]، خوای گەورەی "واجب الوجود" بەوپەڕی ئاسانی "بوون" بە یەك بەدیه[illegible]،

مومكین دەبەخشێت و پۆشاكی گونجاوی "بوون" بە بەری هەموو شتێك دەپۆشێت و، بەمەش هاوسەنگیی نێوان "بوون" و "نەبوون"ی ناهێڵێت. ئنجا گەر ئەو بوونەوەرە ئەركی سەرشانی تەواو بووبێت، ئەوا پۆشاكی بوونی ڕواڵەتی و لە بەرچاوی لەبەر دادەماڵێت و، ڕەوانەی ئەو شتەی دەكات كە بە شێوە و ڕواڵەت پێی دەوترێ "نەبوون" كە لە ڕاستیدا "بوونی مەعنەوی"یە لە بازنەی زانستی خوای گەورەدا.

بەو واتایەی كە ئەگەر بەدیهێنانی شتان بە كاری خوای گەورەی خاوەن توانستی ڕەها دابنرێت، ئەوا زیندووكردنەوەی بەهار هێندەی زیندووكردنەوەی یەك دانە گوڵ و، زیندووكردنەوەی هەموو مرۆڤایەتی لە حەشری مەزندا وەك زیندووكردنەوەی یەك دانە كەس ئاسان دەبێت..

بەڵام ئەگەر بەدیهێنانی شتان بخرێتە ئەستۆی هۆكارەكان، ئەوا بەدیهێنانی یەك دانە گوڵ هێندەی بەدیهێنانی وەرزی بەهارێكی تەواو، هەروەها بەدیهێنانی یەك دانە مێش بە قەدەر بەدیهێنانی سەرجەمی زیندەوەران دژوار دەبێت.

هەروەها وەك ئەوەی كەشتییەكی مەزن و فڕۆكەیەكی گەورە تەنها بە دەستدان لە سویچێكی تایبەتی - لەو ڕووەوە كە نهێنیی ڕێسا و ڕێكوپێكییان تێدایە - هێندە بە ئاسانی دەكەونە ئیش وەك ئەوەی "سەعاتێك" دابمەزرێنرێت و بخرێتە كار..

هەروەك ئەمە وایە.. بە هەمان جۆر بەخشینی قاڵبێكی مەعنەوی و ئەندازەیەكی تایبەت و سنوورێكی دیاریكراو، بەپێی دەستوورەكانی زانستی ئەزەلی و یاساكانی حیكمەتی سەرمەدیی خوایی، بە هەر شتێكی كوللی و جوزئی، گەورە و بچووك، كەم و زۆر، بەپێی چەند دەستوورێكی دیاریكراو و درەوشانەوەی گشتیی "ویستی خوایی"یەوە، كارێك دەكات كە هەموو شتێك لە ناوەندی ڕێكوپێكییەكی تەواوی زانستی و یاسایی ویستی خواییدا بێت..

کەواتە بێگومان بزواندنی کۆمەڵەی خۆر لە لایەن خاوەن توانستی ڕەهاوە لە خولگەی ساڵانەیدا، بە هەمان ئاسانیی سووڕی خوێن و خڕۆکە سوور و سپییەکانی ناوی و، بزواندنیانە چ بە سووڕاندن و چ بە خولانەوە، لە ناوەندی ڕێسا و داناییدا. تەنانەت لە ناوەندی ڕێسای گەردووندا و بە بێ هیچ ڕەنج و ماندووبوونێك، مرۆڤێك هاودەم لەگەڵ سەرجەمی کۆئەندامەکانیدا لە یەك دڵۆپ ئاو بەدی دەهێنێت.

بەو واتایەی کە ئەگەر بەدیهێنانی گەردوون بدرێتە پاڵ ئەو توانستە ڕەها و ئەزەلییە، ئەوا کارەکە هێندەی بەدیهێنانی یەك دانە مرۆڤ ئاسان دەبێت. بەڵام ئەگەر بەو توانستە نەسپێررێت، ئەوا بەدیهێنانی تەنیا مرۆڤێك بە کۆئەندامە سەیر و هەست و نەستەکانیەوە، هێندەی بەدیهێنانی سەرانسەری گەردوون سەخت و پڕ لە گیروگرفت دەبێت.

ئنجا هەروەك تەنیا یەك سەرکردە ئەگەر فەرمانێك بۆ یەك دانە سەرباز دەربکات، ئەوا بەهۆی نهێنی گوێڕایەڵیی و ملکەچی و فەرمانبەرداریەوە، هێرشی پێ دەباتە سەر دوژمن، بە هەمان فەرمان و بە هەمان ئاسانی سوپایەکی مەزنی گوێڕایەڵیش بەرەو هێرش دەداتەبەر..

ئەو بوونەوەرانەش بە هەمان جۆرن کە هەریەکەیان لە کەماڵی گوێڕایەڵیی یاساکانی ویستی خواییدان و ئامادەی وەرگرتنی ئاماژەکانی فەرمانی تەکوینیی پەروەردگارن و، بە وێنەی سەربازی ئامادە و بەندەی فەرمانپێدراو مەیل و شەوقێکی سروشتییان تێدایە لە چوارچێوەی یاسا و دەستوورەکانی ئەو هێڵی هاتوچۆیەی کە زانست و دانستی ئەزەلی بۆی کێشاون و، هەزار جار لە گوێڕایەڵیی سەربازەکانی سوپا زیاتر ملکەچ و گوێڕایەڵن.

جا هەریەك لە بەدیهاتووان، بە تایبەتی زیندەوەرانی نێوانیان، کاتێ فەرمانی پەروەردگاریی: "لە نەبوون وەرە دەر بەرەو بوون و، ئەرکی سەرشانت بگرە ئەستۆ" وەردەگرێت، ئەوا توانستی خوایی بە ئاسانییەکی ڕەها "بوون"ێکی

تایبەتیی پێ دەبەخشێت، بەو وێنە و شـکڵ و شـێوەیەی کە زانسـت و ویسـتی خوای گەورە بـۆی دەستنیشـان کـردووە. ئیـتر بەم جـۆرە دەسـتی دەگرێـت و دەیهێنێتە گۆڕەپانی وجوود.

هەر بەم ئاسـانییە و بە هەمـان هێـز و توانسـت، خـوای گەورە لە وەرزی بەهاردا سوپای زیندەوەران بەدی دەهێنێت و ئەرکەکانیان پێ دەسپێرێت.

بەو واتایەی کە ئەگەر بەدیهێنانی هەمـوو شـتێك بـدرێتە پـاڵ ئەو توانسـتە ڕەهایە ئەوا بەدیهێنانی سەرجەمی سـوپای گەردیلەکـان و گشـت ئەسـتێرەکان هێندەی بەدیهێنـانی یەك گەردیـلە و یەك خـۆر ئاسـان دەبێـت، کەچـی ئەگەر بخرێتە ئەستۆی هۆکارەکـان ئەوا بەدیهێنـانی گەردیـلەیەك لە بیلبـیلەی چـاوی زینـــدەوەرێك یـــان لە مێشـــکیدا بە شـــێوەیەك کە بتوانێـــت ئەرکە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەستۆی ئەنجام بدات، هێنـدەی بەدیهێنـانی سـەرجەمی بوونەوەران سەخت و دژوار دەبێت..

**پلەی سێهەم، کە بریتییە لە:**

(وَبِسرِّ إمْدَادِ الْوَاحِدِيَّةِ وَيُسْرِ الْوَحْدَةِ وَتَجَلِّي الأحَدِيَّةِ).

ناچارین بە چەنـد ئامـاژەیەکی یەکجـار کـورت، ئامـاژە بـۆ نـاوەرۆکەکەی بکەین:

هەروەك سەرکردەیەکی مەزن و پادشایەکی بەشکۆ بەڕێـوەبردنی کاروبـاری وڵاتێکی فـراوان و نەتەوەیەکـی مـەزنی هێنـدەی بەڕێـوەبردنی خـەڵکی یەك دانە گونـد بەلاوە ئاســانە، ئەوەش لە ڕووی یەکبـوونی حـوکمڕانییەکەی و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریی میللەتەکەی تەنها بەپێی فەرمانەکانی ئەو پادشـایە، چونکە لە ڕووی تەنیابوونی خۆی لە فەرمانڕەوایەتیـدا و نەبـوونی هـاوبەش لە حوکمڕانییـدا یەك بە یەکی کەسـانی نەتەوەکە بە وێـنەی دانە دانەی کەسـانی سوپایان لێ دێت، کە دەبن بەهۆی ئاسانکاری بۆ حوکمڕانییەکەی و، بەوپەڕی ئاسانی فەرمان و یاساکان جێبەجێ دەکەن.

بەڵام ئەگەر کاروبارەکانی وڵات بدرێتە دەست چەند حوکمڕانێکی جیاجیا، ئەوا جگە لە بەربوونەوەی وڵات لە هەڵدێری پشێوی و ئاڵۆزیدا، بەڕێوەبردنی تەنها یەك دانە گوند، تەنانەت یەك ماڵیش، هێندەی بەڕێوەبردنی وڵاتێکی گەورە و فراوان گیروگرفتی دێتەڕێ و کارێکی دژوار دەبێت.

پاشان هەموو یەکێکی کەسانی ئەو نەتەوە گوێڕایەڵەی کە پەیوەستن بە یەك سەرکردەوە، بە وێنەی سەرباز، پاڵ بە هێزی ئەو سەرکردەیەوە دەدات و پشت بە گەنجینەی چەك و تەقەمەنییەکانی ئەو دەبەستێ و یارمەتی لە سوپا مەزنەکەی وەردەگرێت. بۆیە دەتوانێت پادشایەکی دوژمن دیل بکات و کاری وا گەورە ڕاپەڕێنێت کە چەندین ئەوەندەی توانای کەسیی خۆی بێت. کەواتە پەیوەندیکردنی بەو پادشایەوە سەرچاوەی هێزێکی گەورەی نەبڕاوە و توانایەکی بێسنوورە و، دەتوانێت لەو ڕێیەوە چەندین کاری گەورە و مەزن ئەنجام بدات..

بەڵام ئەگەر ئەو پەیوەندییە بپچڕێت، ئەوا هێزە گەورەکەی لە دەست دەدات و، تەنها بە ئەندازەی هێزی جوزئیی دەست و بازووی خۆی و ئەو چەك و تەقەمەنییەی کە لە هەگبەکەیدایە دەتوانێت کارەکان ئەنجام بدات. خۆ ئەگەر داوا لەم سەربازە بکرێت بە وێنەی سەربازەکەی تر کار بکات کە پاڵی بە هێزی پادشاوە داوە، ئەوا دەبێ هێندەی هێزی سوپایەکی تەواوەتی هێزی بازووی ببێت و، بە ئەندازەی گەنجینەی چەك و تەقەمەنییەکانی پادشایش چەك و تەقەمەنی لەسەر شانی خۆی هەڵبگرێت!

هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، پادشای ئەزەل و ئەبەد و کردگاری بەتواناش، لە ڕووی یەکبوونی دەستەڵات و فەرمانڕەوایی تەنیا و ڕەهای خۆی، هێندەی ئاسانیی بەڕێوەبردنی شارێك، سەرانسەری گەردوون بەڕێوە دەبات و.. بە قەدەر ئاسانیی بەدیهێنانی باخچەیەك، بەهارێکیش بەدی دەهێنێت و.. بە ئەندازەی سانایی بەدیهێنانی گەڵا و گوڵ وبەروبوومی درەختەکان لە بەهاری ئایندەدا، سەرجەمی مردووانیش لە ڕۆژی حەشردا

زیندوو دەکاتەوە و.. مێشێك بە هەمان ڕێسای هەڵۆیەکی گەورە و بەوپەڕی ئاسانی دروست دەکات و.. بە هەمان ئاسانی مرۆڤێك وەك گەردوونێکی مەزن لێ دەکات..

کەچی ئەگەر ئەم کارانە بە هۆکارەکان بسپێررێت، ئەوا بەدیهێنانی یەك میکرۆب، هێندەی بەدیهێنانی کەرکەدەنێکی گەورە دژوار دەبێت و.. دروستکردنی یەك دانە بەر، بە قەدەر دروستکردنی درەختێکی گەورە گیروگرفتی دێتە ڕێ.. تەنانەت دەبێ - ئەو کاتە - هەریەك لەو گەردیلانەی کە لە چەندین ئەرکی سەرسوورهێنەری ناو خانەکانی جەستەی زیندەوەردا کار دەکەن، چاوێکی ببێت کە هەموو شتێکی پێ ببینێت و زانستێکیشی هەبێت کە لە ڕێیەوە هەموو شتێك بزانێت، تاکو بتوانێت ئەو ئەرکە ورد و ڕێکوپێکانەی لەمەڕ ژیان ئەنجام بدات.

پاشان سووك و ئاسانیی کار لە "یەکبوون"دا دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە دەستەبەربوونی پێداویستی و چەك و تەقەمەنیی سوپایەکی تەواو لە لایەن یەك دەست و لە یەك کارگەوە هێندەی پڕچەککردن و دابینکردنی پێداویستیی یەك دانە سەرباز ئاسان بێت..

خۆ ئەگەر چەند دەستێکی جیاجیا خۆیان لەو کارەدا هەڵبقورتاندایە و هەریەك لەو پێداویستی و کەرەسە سەربازییانە لە چەند کارگەیەکی جیاجیا وەربگیرانایە، ئەوا دابینکردنی کەرەسەکانی یەك دانە سەرباز - لە ڕووی چەندایەتییەوە - هەزار و یەك گیروگرفتی دەهاتە ڕێ، چونکە هێندەی دابینکردنی پێداویستیی هەزار سەرباز کارەکە سەخت دەبێت، لەبەر ئەوەی چەندین فەرماندە و ئەفسەری جیا جیا خۆیان لەو کارەدا هەڵدەقورتێنن.

پاشان ئەگەر بەڕێوەبردن و فەرمان دەزکردن بۆ هەزار سەرباز بە یەك دانە ئەفسەر بدرێت، ئەوەندەی بەڕێوەبردنی یەك دانە سەرباز کارەکە ئاسان دەبێت، لە ڕوویەکەوە. بەڵام ئەگەر ئەم بەڕێوەبردنە بخرێتە ئەستۆی دە ئەفسەرەوە یان

بە خودی سەربازەکان بسپێررێت، ئەوا گەلێ پشێوی و ئاڵۆزی و گیروگرفت سەر هەڵدەدەن.

بە هەمان جۆر، ئەگەر هەموو شتێك بدرێتە پاڵ خوای گەورەی تاك و تەنیا، ئەوا بە ئەندازەی یەك دانە شت کارەکە ئاسان دەبێت، بەڵام ئەگەر بدرێتە پاڵ هۆکارەکان، ئەوا بەڕێوەبردنی یەك دانە زیندەوەر هێندەی گۆی زەوی دژوار دەبێت، تەنانەت هەر لە تواناشدا نابێت!

بەو واتایەی کە "یەکبوون" تا ڕادەی پێویستی و "واجب" بوون ئاسانیی تێدایە. بەڵام "زۆری" و "خۆهەڵقورتاندن"ی دەستە زۆرەکان دژواری و سەختیی کارەکە دەگەیەنێتە ڕادەی نەگونجاوی و لەتوانادا نەبوون!

جا هەروەك لە "مەکتووبات"ی سەرجەمی پەیامەکانی نووردا باس کراوە:
ئەگەر جیاوازیی شەو و ڕۆژو و، جووڵەی ئەستێرەکان و، ئاڵوگۆڕی وەرزەکانی ساڵ (پایز و زستان و بەهار و هاوین) بە یەك کەسی کارساز و یەك دانە فەرماندە بسپێررێت، ئەوا ئەم یەك دانە فەرماندە مەزنە فەرمان بە زەوی دەدات، کە یەکێکە لە سەربازەکانی و، دەڵێت: هەڵسە بخولێرەوە، بڕۆ.. ئەویش لە خۆشیی ئەم فەرمانەدا بە وێنەی مەولەویی شەیدا، بە هەردوو جۆرە بزووتنە ڕۆژانە و ساڵانەکەی خۆی دەکەوێتە گەڕ و، دەبێت بە هۆیەکی سووك و ئاسانی ئاڵوگۆڕی وەرزەکان و جموجووڵی ڕواڵەتی و ئەندێشەیی ئەستێرەکان. بەمەش سووك و ئاسانییەکی لەڕادەبەدەر لە "یەکبوون"دا دەردەخات.

بەڵام ئەگەر ئەم کارە بۆ ئەو تەنها فەرماندەیە دانەنرێت، بەڵکو بۆ هۆکارەکان و حەز و ئارەزووی ئەستێرەکان دابنرێت و، بە زەوی بوترێ: "بووەستە و مەجووڵێ"، ئەوا لەوانەیە بۆ هاتنەدیی چوار وەرزەی ساڵانەی زەوی و پەیدابوونی شەو و ڕۆژ پێویست بەوە بکات کە هەزاران ئەستێرە و خۆری هەزاران جار لە زەوی گەورەتر، هەموو شەوێك و هەموو ساڵێك،

ماوەی درێژخایەنی ملیۆنەها بەڵکو ملیارەها ساڵ ببڕن! واتە کارەکە تا پلەی مەحاڵ و نەگونجاوی سەختی و گیروگرفتی دێتەڕێ.

جا وشەی: "تَجَلِّي الأَحَدِيَّة" کە لە "پلەی سێهەم"دا هاتووە، ئاماژە بۆ ڕاستییەك دەکات کە لەوپەڕی فراوانی و قووڵی و وردی و گەورەییدایە. درێژەپێدانی و چەسپاندنی بە پەیامەکانی نوور دەسپێرین و، لێرەدا لە نێوان نموونەیەکی بچووکدا یەك دانە لە سەرنجەکانی ڕوون دەکەینەوە:

بەڵێ، هەروەك "خۆر" بە ڕووناکییەکەی خۆی سەرانسەری زەوی ڕۆشن دەکاتەوە و دەبێت بە نموونەیەك لەسەر "یەکبوون" و "یەکتایی".. بوونی وێنە و شێوەکەشی لەگەڵ حەوت ڕەنگەکانیدا و وێنەی زاتی خۆی لە هەر شتێکی ڕوونی ئاوێنە ئاسای بەرامبەریدا، دەبێت بە نموونەیەك لەسەر "تەنیایی".

خۆ ئەگەر "خۆر"خاوەنی زانست و توانست و ئیختیار بوایە و، پارچە شووشە و دڵۆپە ئاوەکان و بڵقەکانی سەر ڕووی دەریا، کە وێنەی خۆر دەدەنەوە، ئەوانیش دارای توانا و قابیلییەت بوونایە، ئەوا بە یاسای ویستی خوای گەورە خۆرێکی تەواوەتی بە شێوە و سیفەتەکانیەوە لە تەنیشت و لەناو هەموو یەکێکی ئەو شتانەدا دەبوو کە وێنەی خۆریان دایەوە، بێ ئەوەی بوونی لە شوێنەکانی تردا ڕێ لە کارەکەی بگرێت، یان کەمی بکاتەوە.

ئەمەش ئاسانیی لە ڕادەبەدەری "تەنیایی" دەردەخات.

هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، کردگاری مەزن و شکۆمەندیش - لە ڕووی تاکی و یەکبوونیەوە - هەموو شتان دەبینێت و، بە زانست و ویست و توانستی گشتگیری خۆی چاودێرە بەسەریانەوە..

هەروەها لە ڕووی درەوشانەوەی "تەنیایی"شەوە لەگەڵ هەموو شتێك - بە تایبەت زیندەوەران - بە ناوەکانی و سیفەتە شکۆمەندەکانی ئامادەیە. بە ڕادەیەك کە بەوپەڕی ئاسانی و لە یەك کاتدا مێشێك لە ڕێسای هەڵۆیەکدا و، مرۆڤ لە ڕێسای گەردووندا بەدی دەهێنێت.

بەم جۆرە و بە چەندین موعجیزەی زۆر و زەبەندە، زیندەوەران دروست دەکات، بە چەشنێ کە ئەگەر هۆکارەکان بۆ بەدیهێنانی یەك دانە بولبول یان یەك دانە مێش کۆببنەوە، هەموویان لە ئاستی ئەو کارەدا دەستەوسان دەمێنن..

کەواتە ئەو کەسەی بولبولێك بەدی دەهێنێت، هەر ئەوە - نەك کەسی تر - کە بەدیهێنەری هەموو باڵندەکانە و.. ئەو کەسەش کە مرۆڤ دروست دەکات، هەر ئەوە - نەك کەسی تر - گەردوونی بەدی هێناوە.

**پلەی چوارەم و پێنجەم، کە بریتییە لە:**

(وَبِسِرِّ الْوُجُوْبِ وَالتَّجَرُّدِ وَمُبَايَنَةِ الْمَاهِيَّةِ.. وَبِسِرِّ عَدَمِ التَّقَيُّدِ وَعَدَمِ التَّحَيُّزِ وَعَدَمِ التَّجَزِّي).

گواستنەوەی واتاکانی ئەم دوو پلەیە بۆ تێگەیاندنی زۆرینە(عوام)ی خەڵکی گەلێ سەخت و دژوارە. بۆیە بە پوختی ناوەرۆکەکەیان ڕوون دەکەینەوە، لەگەڵ باسکردنی چەند کورتە سەرنجێکدا:

واتە: کەسێکی خاوەن توانستی ڕەها "بوون"ێکی ئەوتۆی هەیە کە بەهێزترینی پلەکانی "بوون"ە، کە پلەی "واجب الوجود"ە و، ئەزەلی و ئەبەدییە و، خاوێن و دەستبەرداره لە شتی "ماددی" و، ماهییەتێکی پاك و جیای لە هەموو ماهییەتەکانی تر هەیە..

ئەم خاوەن توانستە ڕەهایە، بەڕێوەبردنی ئەستێرەکانی وەك بەڕێوەبردنی گەردیلەکان و، حەشری هەرە مەزنی هێندەی حەشری بەهار و، زیندووکردنەوەی هەموو گرۆی مرۆڤی لە حەشردا وەك زیندووکردنەوەی یەك دانە کەسیان، بەلاوە ئاسانە. چونکە بە ئەندازەی سەری پەنجەیەك لە جۆرێکی بەهێزی چینەکانی "بوون"، چیایەکی گەورەی چینێکی تەنکی "بوون" هەڵدەگرێت و بەڕێوەی دەبات..

بۆ نموونە:

"ئاوێنە" و "هێزی پارێزکار"ی مرۆڤ، کە خاوەنی بوونی دەرەکی و بەهێزن، دەتوانن سەد چیا و هەزار کتێبی جیهانێکی میسالی و مەعنەوی - کە تەنك و لاوازن - لەخۆ بگرن و بەڕێوەی بەرن!

هەر بەم جۆرە و بە ئەندازەی نزمیی هێزی "بوون"ی میسالی لەچاو هێزی "بوون"ی دەرەکیدا.. هەموو جۆرە "بوون"ە پەیدابووەکان بە هەزاران جار لەچاو "بوون"ی "واجب الوجود"ی سەرمەدی و ئەزەلیدا نزمتر و تەنکترن، بە ڕادەیەك کە درەوشانەوەیەکی هێندەی یەك گەردیلەی ئەو "بوون"ە "واجب"ە جیهانێك لە "مومکینات" بەڕێوە دەبات!

زۆر بە داخەوەم کە سێ هۆکاری هاوشێوەی ئەو نەخۆشییەم کە لە ژەهر پێدانمەوە تووشم بووە، بوارم بە ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم ڕاستییە مەزنە و سەرنجەکانی پێ نادەن. بۆیە ئێستا بە پەیامەکانی نووریان دەسپێرین و، پشت بە خوا ئەو ڕوونکردنەوەیە بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین.

**پلەی شەشەم، کە بریتییە لە:**

(وَبِسِرِّ انْقِلابِ الْعَوَائِقِ وَالْمَوَانِعِ إلىَ حُكْمِ الْوَسَائِلِ الْمُسَهِّلاتِ).

واتە:

هەروەك بە درەوشانەوەی یاسایەکی ویستی خوایی و فەرمانی تەکوینی - کە لە زانستە تازەکاندا پێی دەڵێن گرێی ژیان - و تەنها بە ئاراستەبوونی ئەو ویست و فەرمانە لەو گرێی ژیانەوە کە وەك بزوێنەر و زەمبەلەکی ئەو زیندەوەرە وایە، سەرجەم ڕۆزی و کەرەسەی پێویست دەڕوات بۆ هەموو بەر و گەڵا و گوڵەکانی درەختێکی گەورەی بێ هەست و نەست و، هەرگیز لق و پەل و ڕەگە ڕەق و بەهێزەکانی نابن بە ڕێگر و لەمپەر لە ڕێی گەیشتنی ئەو کەرەسە و ڕۆزییانە بۆ شوێنی خۆیان، بەڵکو دەبن بەهۆی ئاسانکاری..

لە بەدیهێنانی گەردوون و بوونەوەرانیشدا سەرجەمی ڕێگر و لەمپەرەکان لە ئاستی درەوشانەوەی ویستی خوایی و ئاراستەبوونی فەرمانی پەروەردگاردا واز لە ڕێگری و لەمپەر دروستکردن دەهێنن و، دەبن بەهۆی ئاسانکردن. ئیتر توانستی سەرمەدیی خوای گەورە، بە ئەندازەی ئاسانیی بەدیهێنانی ئەو درەختە، سەرانسەری گەردوون و سەرجەمی بوونەوەرانی گۆی زەویش بەدی دەهێنێت و، هیچ شتێکی بەلاوە قورس نابێت.

بەڵام ئەگەر کاری بەدیهێنان نەدرێتە پاڵ ئەو توانستە، ئەوا بەدیهێنان و بەڕێوەبردنی ئەو تەنیا درەختە بە قەدەر قورسی و گیروگرفتی دروستکردن و بەڕێوەبردنی هەموو درەختەکان، تەنانەت هێندەی قورسی و گیروگرفتی دروستکردن و بەڕێوەبردنی گۆی زەوی، سەخت و دژوار دەبێت. چونکە ئەو کاتە هەموو شتێك دەبێت بە ڕێگر و لەمپەر لە بەردەم ئەو کارەدا و، گەر هەرچی هۆکار هەن - لەم حاڵەتەدا - کۆببنەوە و پشتی یەکتر بگرن هێشتا هەر ناتوانن ڕۆزیی پێویست لە گەدەی گرێی ژیان و زەمبەلەکەکەیەوە (کە لە فەرمان و ویستی خواییەوە پەیدا دەبێت) ڕەوانە بکەن و بە ڕێکوپێکی بیگەیەننە گەڵا و پەل و بەروبوومەکانی، مەگەر - کە ئەوەش مەحاڵە - یەك بە یەکی بەشەکانی ئەو درەختە، تەنانەت هەموو یەکێك لە گەردیلەکانی، چاوێکی ببێت هەموو بەش و هەموو گەردیلەیەکی درەختەکە ببینێت و، زانستێکی گشتگیری وای هەبێت کە دەوراندەوری هەموو شتێکی دابێت و ، خاوەنی توانستێکی ئەوتۆش بێت کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ و بەتوانا بێت!

ئیتر بەم شێوەیە، بۆ خۆت بەم پێنج پلەیەدا سەربکەوە و، سەیر بکە و، ببینە کە:

ڕێی کوفر و شیرك چەندە مەحاڵ و گرفتی تێدایە و، بزانە چەندە کارێکی نەگونجاوە و، تا چ ڕادەیەکیش لە هەموو پێوەر و تەرازوویەکی مەنتیق و ژیرییەوە دوورە..

لە هەمان کاتدا بزانە کە ڕێی ئیمان و قورئان چەندە ئاسانیی تێدایە، بگرە چۆن تا ڕادەی "وجووب" ڕاست و حەق و ڕەوایە و، چەندەش تا پلەی "پێویستی" ژیری وەری دەگرێت و، ئاسان و بێگومانە..

بۆ خۆت ئەم ڕاستییە ببینە و، بڵێ:

(الْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلَى نِعْمَهِ الْإِيْمَانِ).

گوشار و تەنگ پێ هەڵچنینەکان، بوون بە هۆی دواخستنی بەشی پاشماوەی ئەم پلە مەزنە بۆ کاتێکی تر، بە پشتیوانیی خوای گەورە.

**پلەی حەوتەم، کە بریتییە لە:**

(وَبِسِرِّ أَنَّ الذَّرَّةَ وَالْجُزْءَ وَالْجُزْئِيَّ وَالنَّوَاةَ وَالْإِنْسَانَ لَيْسَتْ بِأَقَلَّ صَنْعَةً وَجَزَالَةً مِنْ النَّجْمِ وَالْكُلِّ وَالْكُلِّيِّ وَالشَّجَرِ وَالْعَالَمِ).

**بێدارکردنەوەیەك:**

بناغە و گەنجینە و خۆری ڕاستییەکانی ئەم نۆ پلەیە، دوو ئایەتەکەی سوورەتی ئیخلاسە: ﴿قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ ۞ اللّٰهُ الصَّمَدُ﴾. کەواتە ئەم پلانە چەند پوختە ئاماژەیەکن بۆ درەوشانەوەی "ئەحەدییەت" و "صەمەدییەت".

بە یەك دوو سەرنج، سەیرێکی ناوەرۆکی ئەم پلەی حەوتەمە دەکەین و، درێژەپێدانی بە پەیامەکانی نوور دەسپێرین:

ئەم پلەیە ئەوە دەگەیەنێت کە:

ئەو گەردیلەیەی کە چەندین ئەرکی سەرسوورهێنەر لە مێشك و چاودا ڕادەپەڕێنێت، لە ڕووی سنعەت و داهێنانەوە هیچی لە ئەستێرەکان کەمتر نییە و، ڕێکوپێکیی "جوزء"یش لە کۆی "کوللی" کەمتر نییە.

بۆ نموونە:

مێشك و چاو، لە ڕووی ڕێکوپێکی و داهێنانەوە، هیچیان لە مرۆڤ کەمتر نییە.. تاك و دانەی جوزئی، لە داهێناندا و لە ڕووی جوانیی و وردەکاری و

نامۆیی و بەدیهاتنیەوە، بە گشتی هیچی لە جۆرەکەی کەمتر نییە و.. سنعەتی مرۆڤیش، لە ڕووی کۆئەندامە سەرسووڕهێنەرەکانیەوە، لە ڕەگەزی هەمەکیی زیندەوەر کەمتر نییە و.. ڕێکوپێکیی ئەو تۆوەش کە وەك پێڕست و بەرنامە و هێزی پارێزکاری درەخت وایە، لە ڕووی کەماڵی سنعەت و ئەمبارکردنەوە، لە درەختە مەزنەکەی خۆی کەمتر نییە و.. ئەو مرۆڤەش کە گەردوونێکی بچووکە، لە ناوازەیی داهێناندا لە گەردوونی مەزن کەمتر نییە، لەو ڕووەوە کە لە جوانترین شێوەدا بەدیهێنراوە و هێندە کۆئەندامی گشتی و دەراسای هەیە کە ئامادەی ئەنجامدانی هەزاران فەرمان و ئەرکی سەرسووڕهێنەری کردووە.

کەواتە ئەو کەسەی گەردیلە دروست دەکات، لە بەدیهێنانی ئەستێرەدا دەستەوسان نابێت و.. ئەو کەسەی زمان بەدی دەهێنێت - کە ئەندامێکی مرۆڤە - بە بێگومانی و ئەوپەڕی ئاسانی مرۆڤ دروست دەکات و.. ئەو کەسەی کە مرۆڤی لە جوانترین شێوەدا بەدی هێناوە، بە بێ هیچ گومانێك دەتوانێت بەوپەڕی ئاسانی هەموو زیندەوەرانیش - وەك لە بەرچاوماندا دەیکات - بەدی بهێنێت و.. ئەو کەسەی "تۆو" بە وێنەی پێڕست و لیستی دانە دانەی شتانی ئایندەی و دەفتەرێکی یاسا ئەمرییەکانی خوای گەورە و گرێی ژیان بەدی دەهێنێت، بێگومان هەر ئەوە کە بەدیهێنەری درەختەکانە و.. ئەو کەسەی مرۆڤی وەك تۆوێکی مەعنەویی درەختی جیهان و بەرێکی گشتیی ئەو درەختە بەدیهێناوە و کردوویەتی بە ئاوێنەیەك کە هەموو ناوە جوانەکانی خۆی لەودا دەرخستووە و، پەیوەندیی بە سەرانسەری بوونەوەرانەوە هەیە و، جێنشینی زەوییە، بێ هیچ گومانێك ئەو کەسە خاوەنی توانستێکی ئەوتۆیە کە بە وێنەی ئاسانیی بەدیهێنانی مرۆڤ سەرتاسەری گەردوونیش بەدی بهێنێت و ڕێکی بخات.

کەواتە ئەو کەسەی کە پەروەردگار و بەدیهێنەر و کردگاری گەردیلە و، جوزء و، جوزئی و، تۆو و، مرۆڤ بێت، بەوپەڕی ڕوونی و بێگومانی، هەر

خۆی بەدیهێنەر و کردگار و پەروەردگاری ئەستێرەکان و، جۆرەکان و، کوللی و، هەمەکییەکان و، درەختەکان و، سەرجەمی بوونەوەران دەبێت.

واتە مەحاڵە کەسێکی تری غەیری ئەو بێت و، هەرگیزاو هەرگیز شتی وا ڕوو نادات.

**پلەی هەشتەم:**

(وَبِسِرِّ أَنَّ الْمُحَاطَ وَالْجُزْئِيَّاتِ كالأَمْثِلَةِ الْمَكْتُوْبَةِ الْمُصَغَّرَةِ أَوْ كالنُّقَطِ الْمَحْلُوْبَةِ الْمُعَصَّرَةِ. فلابُدَّ أَنْ يَكُوْنَ الْمُحِيْطُ وَالْكُلِّيَاتُ فِي قَبْضَةِ خَالِقِ الْمُحَاطِ وَالْجُزْئِيَّاتِ لِيُدْرِجَ مِثَالَهَا فيهَا بِمَوَازِيْنِ عِلْمِهِ أَوْ يُعَصِّرَهَا منهَا بِدَسَاتِيرِ حِكْمَتِهِ).

واتە: ڕێژەی جوزئیات و، دانە و، ناوك و، تۆوەکان، کە کوللی و کوللیات[1] لە خۆیان گرتوون، لەچاو هەمەکییە گەورە و گشتگیر و دەورەدەرەکاندا وەك ڕێژەی چەند نموونەیەکی بچووك وایە کە بە وردی و بە ئەندازەی بچووکییان هەمان شتیان تێدا نووسرابێت کە لە کوللی و کوللیاتدا نووسراون.

لەبەر ئەمە، هەمەکییە گشتگیرەکان، بێ هیچ گومانێك، لەناو دەست و لە ژێر دەستەڵاتی بەدیهێنەری ئەو هەندەکییانەدایە، تاکو بە پێوەر و تەرازووەکانی خۆی و بە قەڵەمە وردەکانی، ئەو کتێبە گشتگیرە مەزنە لە سەدان وردە پارچە و دەفتەری بچووکدا بنووسێت.

پاشان ڕێژەی بەش و هەندەکییە دەورەدراوەکان لە چاو هەمەکییە دەورەدەرە گشتگیرەکاندا وەك ئەو دڵۆپە دۆشراوانە وایە کە لە هەمەکییە دەورە دەرەکانەوە گوشرابن..

---

(١) ئەمانە چەند زاراوەیەکی زانستی "مەنتیق"ن. "كُلّ" واتە: ئەو شتەی کە لە چەند بەشێك پێکهاتووە (وەك جەستەی زیندەوەر)، بەڵام "جُزء" واتە: ئەو بەشانەی کە "كُلّ"یان لێ پێکدێت (وەك ئەندامەکانی ئەو جەستەیە). نموونەی "كُلِّي"ش وەك "ئادەمیزاد"، بەڵام "جوزئي" دانەدانەیان (وەك ئازاد و شێرزاد.. هتد). (وەرگێڕ)

بۆ نموونە:

تۆوی کاڵەك وەك دڵۆپێك وایە لە هەموو لایەکی کـاڵەکەکەوە دۆشرابێـت، یـان وەك خاڵێـك وایە کە کتێبـی تەواوەتیـی کـاڵەکەکەی تێـدا نووسرابێـت، تەنانەت پێڕست و بەرنامە و لیستی ناوەڕۆکی ئەو کتێبەی لەخۆ گرتووە..

مـادەم وایە، ئەوا دەبـێ ئەو هەنـدەکی و دڵـۆپ و خـاڵ و دانە و تاکـانە لە دەستی بەدیهێنەری ئەو "کُلّ" و هەمەکییە گشتگیر و دەورەدەرانەدا بن، تـاکو بە دەسـتوورە هەسـتیارەکانی دانـایی خـۆی ئەو دانە و دڵـۆپ و خاڵانەیـان لـێ بگووشێت.

بەو واتـایەی کە: بەدیهێـنەری یەك دانە "تـۆو" و یەك دانە شـت، هەر ئەو کەسەیە کە بەدیهێنەری ئەو "کُلّ"ە گەورە و شـتە هەمەکییـانەیە و، بەدیهێـنەری هەمەکی و ڕەگەزەکانیان کە لەوان گەورەتریشـن و دەورەیـانی داوە، جـگە لەو کەسی تر نییە.

لەبەر ئەوە، بەدیهێنەری یەك دانە کەس، هەموو خەڵکی بەدی دەهێنێـت و، ئەو کەسـەش مـرۆڤێکی مـردوو زینـدوو بکـاتەوە، هەر ئەو لە ڕۆژی حەشری مەزنـدا سـەرجەمی مـردوانی جیننـی و ئـادەمیزاد زینـدوو دەکـاتەوە. هەروەك زیندووشیان دەکاتەوە.

بەم جـۆرە، ڕادەی ڕاسـتیی دەعـوای ﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ (لقمان:٢٨) لە جوانترین و ڕووناکترین شێوەیدا ببینە و، بۆ خۆت بـزانە تا چ ڕادەیەك بێگومان و چەسپاوە!

**پلەی نۆهەم:**

(وَبِسرٍّ كَمَا أنَّ قُرْآنَ الْعِزَّةِ الْمَكْتُـوبَ عَـلَى الـذَّرَّةِ الْمُسَـمَّاةِ بِـالْجَوْهَرِ الْفَـرْدِ بِذَرَّاتِ الأثِيْرِ لَيْسَ بِأقَلَّ جَزالَةً وَخَارِقِيَّةَ صَنْعَةٍ مِنْ قُرْآنِ الْعَظَمَةِ الْمَكْتُـوْبِ عَـلَى صَحِيْفَةِ السَّمَاءِ بِمِدَادِ النُّجُوْمِ وَالشُّمُوْسِ، كَذٰلِكَ أنَّ وَرْدَ الزَّهْـرَةِ لَيْسَـتْ بِأقَـلَّ

جَزَالَةً وَصَنْعَةً مِنْ دُرِّيِّ نَجْمِ الزُّهْرَةِ وَلا النَّمْلَةَ مِنَ الْفِيْلَةِ وَلا الْمِكْرُوْبَ مِنَ الْكَرْكَدَنِّ وَلا النَّحْلَةَ مِنَ النَّخْلَةِ بِالنِّسْبَةِ إِلَى قُدْرَةِ خَالِقِ الْكَائِنَاتِ. فَكَمَا أَنَّ غَايَةَ كَمَالِ السُّرْعَةِ وَالسُّهُوْلَةِ فِي إِيْجَادِ الأَشْيَاءِ أَوْقَعَتْ أَهْلَ الضَّلالَةِ فِي الْتِبَاسِ التَّشْكِيْلِ بِالتَّشَكُّلِ الْمُسْتَلْزِمِ لِمُحَالاتٍ غَيْرِ مَحْدُوْدَةٍ تَمُجُّهَا الأَوْهَامُ، كَذَٰلِكَ أَثْبَتَتْ لأَهْلِ الْهِدَايَةِ تَسَاوِيَ النُّجُوْمِ مَعَ الذَّرَّاتِ بِالنِّسْبَةِ إِلَى قُدْرَةِ خَالِقِ الْكَائِنَاتِ. جَلَّ جَلالُهُ، لا إِلٰهَ إلاّ هُوَ، اللّٰهُ أَكْبَرُ).

دەمویست ناوەرۆکی ئەم دواهەمین پلەیە بە دوور و درێژی ڕوون بکەمەوە، بەڵام بە داخەوە سەختی و تەنگ پێ هەڵچنین و گوشاری ئەنجامی خۆ هەڵقورتاندنی هەڕەمەکی و، لاوازیی جەستەشم بەهۆی ژەهر پێدانم، وێڕای نەخۆشییە ئازاربەخشەکانیش، ڕێی ئەو ڕوونکردنەوەیەیان لێ گرتم. بۆیە ناچار بووم تەنها چەند ئاماژەیەکی یەکجار کورت بۆ ناوەرۆکەکەی بکەم.

ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت کە:

هەروەك ئەگەر قورئانێکی مەزن لەسەر گەردیلەیەك - کە لە زانستی کەلام و فەلسەفەدا پێی دەوترێ "گەوهەری یەکتا" و، دابەشبوون هەڵناگرێت - بە گەردیلەکانی ئەثیر - کە لەو بچووکترن - بنووسرێتەوە و.. لە هەمان کاتدا قورئانێکی تری گەورە لەسەر لاپەڕەی ئاسمانەکاندا بە خۆر و ئەستێرەکان بنووسرێتەوە و، ئنجا بەراورد لە نێوانیاندا بکرێت، ئەوا بێگومان دەردەکەوێت کە ڕەوانی و وردیی سنعەتی ئەو قورئانەی کە لەسەر گەوهەری یەکتا نووسراوە لە ڕووی تۆکمەیی و داهێنانەوە لەو قورئانە مەزنە کەمتر نییە کە ڕووی ئاسمانەکانی جوان کردووە و، لەوانەیە لە ڕوویەکەوە لەویش تۆکمەتر بێت.

هەروەها گوڵ لە ڕووی تۆکمەیی سنعەتەوە لە هەسارەی ناهید (زوهرە) کەمتر نییە و، مێروولەش لە فیل نزمتر نییە، تەنانەت لە ڕووی بەدیهێنانەوە میکرۆب زیاتر لە کەرکەدەن داهێنانی تێدایە، سروشتی سەرسووڕهێنەری

هەنگـــیش لە توانســـتی بەدیهێـــنەری بوونەوەرانـــدا، لە دارخورمـــا سەرسوورڕهێنەرترە..

بەو واتایەی کە بەدیهێنەری هەنگ، هەموو زیندەوەران دروست دەکات و.. ئەو کەسەی یەك دانە مرۆڤ زیندوو دەکاتەوە هەر ئەوە کە هەمـوو خەڵـکی لە گۆڕەپانی حەشردا زیندوو دەکاتەوە و بە حەتمی ژیانیان پێ دەبەخشێتەوە.

کەواتە هیچ شتێك بە لای ئەو توانستەوە قورس و گران نیـیە، وەك هەمـوو بەهارێك سەدان هەزار نموونەی حەشر لە بەرچاوی خۆماندا پیشان دەدرێت.

پوختە ناوەرۆکی دواهەمین ڕستەی بڕگە عەرەبییەکەش بریتییە لەوەی کە:

گومڕایـان، لەبەر ئەوەی ئەو ڕاسـتییە تونـدوتۆڵ و دامەزراوانەی پلەکـانی پێشوو نـازانن و، لەبەر ئەوەش بـوونەوەران بەوپەڕی ئاسـانی و خێرایـی دێـنە وجوود، ئەوا دروسـتبوون و بەدیهـاتنی بوونەوەرانیـان بە توانـای کردگـارێکی خاوەن توانستی ڕەها، لەگەڵ پێکهاتن و دروست بوونیاندا لە خـۆڕا و هەر بـۆ خۆیان، لێ تێکچووە و، ئەم دوو شتەیان لێ ئاڵۆزاوە. بەمەش دەرگایان لەسەر چەندین خورافات و مەحاڵی بێسنووری ئەوتۆ خستووەتە سەرپشت کە زەین و وەهمەکانیش بێزی لێ دەکەنەوە. چـونکە لەم حـاڵەتەدا دەبـێ - بـۆ نمـوونە - هەموو گەردیلەیەك لە هەر زیندەوەرێکدا توانسـتێکی پـێ بـدرێت کە بتوانێـت هەموو شتێك دروست بکات و چاوێکی پێ ببەخشرێت کە هەموو شتێکی پێ ببینێت.

واتە: ئەوان لەبەر ئەوەی یەك خوایـان قبـووڵ نەکـرد، ناچـار بـوون بەپێـی ڕێچکە و ڕێبازەکەیان، بە ژمارەی گەردیلەکان خوای درۆیـنە قبـووڵ بـکەن و، بەمەش شایستەیی ڕۆشتنیان بۆ بنکی پلە هەرە نزمەکانی دۆزەخ بەدەست هێنا.

بەڵام ئەهلی هیدایەت، ڕاستییە بەهێزەکان و بەڵگە توندوتۆڵەکانی پلەکـانی پێشوو، قەنـاعەتێکی تەواوەتی و بێکۆتـایی و، ئـیمان و تەسـدیقێکی تـا ڕادەی "عين اليقين"یان بە دڵی ساغ و ژیریی ڕاست و دروستی ئەوان بەخشـیوە و، بە

بێ هیچ شوبهە و گومانێك و بەوپەڕی دڵنیایی باوەڕیان بەوە هێناوە کە بە لای توانستی خوای گەورەوە هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەستێرەکان و گەردیلەکانـدا نییە و، گەورەترین و بچووکترین شت بەلای ئەو توانستەوە یەکسانە، چونکە لە بەرچـاوی خۆمانـدا ئەم بەدیهـاتووە سـەیرانە دەبینـین و، هەریەك لەو سـنعەتە سەرسووڕهێنەرانە تەسدیقی دەعوای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکات ﴿مَا خَلْقُكُـمْ وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كنَفْسٍ وَاحِـدَةٍ﴾ و، شایەتی لەسەر ئەوە دەدات کە بڕیاری ئەم ئایەتە عەینی حەق و خودی حەقیقەتە و، بە زمانی حاڵ دەڵێن:

(اللّهُ أكْبَرَ).

ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە، بە ژمارەی هەموو بـوونەوەران دەڵێـین: (اللّـهُ أكْبَرَ) و، بە هەموو هێز و قەنـاعەتێکمان تەسـدیقی بڕیـاری ئەم ئـایەتە پیـرۆزە دەکەین و، بە چەندین بەڵگەی بێکۆتایی شایەتی دەدەین کە بڕیـاری ئەم ئـایەتە عەینی حەق و خودی حەقیقەتە.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إنَّكَ أنْتَ العَلِيْمُ الْحَكِيْمُ﴾.

اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَى مَنْ أرْسَلْتَهُ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينْ.

وَالْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينْ.

* * *

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* نـاوی "بەدیعوززەمـان ســەعیدی نـوورسی"یە. لە گونـدی "نـوورس"ی سـەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی باکووری کوردستان لە بنەماڵەیەکی کوردی موسڵمان لەدایـك بووە و، لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* گەورەترین کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمە و مەزنترین زانـایە کە لە دوای مەولانـا خالیدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی کورددا هاتووەتە دنیاوە و، ناوبانگی جیهـانیی بـۆ دروسـت بـووە و، لە ڕووبەرێـکی فـراوانی سـەر زەویـدا سـوود لە بەرهەمەکـانی وەردەگیرێت.
* لەبەر زیرەکیـی نـاوازە و لە ڕادەبەدەری، نازنـاوی (سـەعیدی مەشـهوور) پاشـان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەســە هەوڵـی داوە بـۆ دامەزرانـدنی زانکـۆ لە کوردسـتاندا و، کـردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سـەردەم شـان بە شـانی زانسـتە ئاینییەکان.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێـر ناونیشـانی (**سـەرجەمی پەیامەکـانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* بە زیاتر لە شەست زمان و زاری جیهانی کتێبەکانی بڵاوبوونەتەوە.
* بە (زمـانی کـوردی) (**سـەرجەمی پەیامەکـانی نـوور**)مـان لە نـۆ بەرگـی گەورەدا چاپکردوە، جگە لە چل و دوو کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.
* تا ئێستا زیاتر لە شەست کۆنفرانسی جیهانی و دەیان کـۆڕی زانسـتی و پێشـبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێـب و، سـەدان لێکـۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەنـدین بەڵگەنـامەی زانکۆییشـــی لە خوێنـدنی بـاڵادا لەسـەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.

# پێڕستی بابەتەکان

## (پەیامەکانی نوور) بە زمانی کوردی

### یەکەم: کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ

١ - پەیامی بیماران
٢ - پەیامی پیران
٣ - وتە بچووکەکان
٤ - سروشت هونەرە یان.. ؟!
٥ - مەلائیکەت و ژیانی دوارۆژ
٦ - پەیامی ڕەمەزان
٧ - حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان
٨ - پەیامی ئیخلاس و برایەتی
٩ - زللەی میهرەبانی
١٠ - چارەسەری وەسوەسە
١١ - مرۆڤ و ئیمان
١٢ - بەری درەختی ئیمان
١٣ - موعجیزاتی ئەحـمەدي
١٤ - ئیجتیهاد لەم سەردەمەدا
١٥ - پەنجەرەکان
١٦ - پەیامی حەشر
١٧ - (من) خودیی مرۆڤ
١٨ - ڕابەری لاوان
١٩ - ڕابەری خوشکان
٢٠ - ڕابەری خزمەتگوزاران
٢١ - ڕاستییەکانی ئیمان
٢٢ - ڕاستیی تەوحید
٢٣ - شوکرانەبژێری
٢٤ - بینینەکانی گەشتیارێك
٢٥ - میعراجی پێغەمبەر ﷺ
٢٦ - موعجیزاتی قورئانی
٢٧ - سوننەتی پێغەمبەر ﷺ
٢٨ - نوورەکانی حەقیقەت
٢٩ - موناجات
٣٠ - کلیلێك بۆ جیهانی نوور
٣١ - وتاری شام
٣٢ - مونازەرات
٣٣ - بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی
٣٤ - سنووحات
٣٥ - گزنگەکان.. ئاماژەکان ..
٣٦- پەیامی قەدەر
٣٧- تەوحید.. بەروبوومەکانی..
٣٨ - ناوی هەرە مەزن
٣٩ - خوای گەورەم بەسە
٤٠- بناغەکانی تێگەیشتن لە ...
٤١ - چەپکێك پەروەردەی ئیمانی
٤٢ - بەڵگەی درەختشان

### دووهەم: کۆمەڵە پەیام و بەرگی گەورە

١ - وتەکان
٢ - مەکتووبات
٣ - بریسکەکان
٤ - تیشکەکان
٥ - پاشبەندەکان
٦ - داوەرییەکان
٧ - ئاماژەکانی ئیعجاز
٨ - مەسنەویی نووری
٩ - ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی

# الحُجَّةُ الزَّهْرَاء

من كليات رسائل النور التي ألفها: **الأستاذ بديع الزمان سعيد النورسي**

ترجمها من التركية إلى العربية: **الأستاذ إحسان قاسم الصالحي**

نقلها من العربية إلى الكردية: **فاروق رسول يحيى**

الطبعة الأولى - السليمانية

١٤٤٢هـ/٢٠٢١م

* * *

# The Shining Proof of The Truths of Belief

From the Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi

Translated from Arabic into Kurdish by:

Farooq Rasool Yahya

2021

# بەڵگەی درەخشان

ئەگەر دەتەوێ :

❀ شارەزای ئەو بەڵگانەی ئیمان ببیت کە هەردوو "وشەی شایەتمان" بە مرۆڤی دەبەخشن؟

❀ بە زانینی پوختەواتایەکی "سوورەتی فاتیحە" هەست بە چێژی ئیمان لە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا بکەیت؟

❀ "بەدیهێنەر"ت لە ڕێی سیفەتە مەزنەکان و، ئاسەوارەکان و، ناوە جوانەکانیەوە بە دروستی بناسیت؟

❀ بزانیت کە چۆن وشەکانی "تەحیات" دەبن بە بەڵگە لەسەر "زانست"ی خوای گەورە؟

ئەگەر دەتەوێت بەم زانیارییانە ئاشنا ببیت و چێژی ئیمانییان لێ وەربگریت، فەرموو بە شێنەیی ئەم پەیامە بخوێنەرەوە.

## الحُجَّةُ الزَّهْراء

من كليات رسائل النور

التي ألفها الأستاذ:

بديع الزمان سعيد النورسي

(رحمه الله)

## The Shining Proof of The Truths of Belief

From

The Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi



0-0260-0000-8

9 780026 000000

نرخی (١٥٠٠) دینارە